




ژمارە

١٧

( تشرینی یەکەم ) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات

- بەرنامەیەك بۆ درووست كردنی كارتی ناونیشان
- چارەسەركردنی ڤایرۆسی Pictures
- بیل گیتس كەسایەتیەكی سەركەوتووە شایەنە بكرێتە پێشەنگ
- كۆمەڵێك ماڵپەری كوردی جۆرا و جۆر
- هەموو كلیلە كورت كراوەكانی بەرنامەی فۆتۆ شۆپ



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر - ٢٠٠٦



# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمـــارە
١٧
تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦

**گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات**


**تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت**


**ناونیشان :**
هەرێمی کوردستـــــان/ عێراق ـ هەولێر . بەرامبەر دەرگای قەلاّ باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا
نهۆمی دووەم شوێنی مەلبەندی کۆمپیوتەری ئاراس ی کۆن بۆ هەر پێشنیـــــار و سەرنجێـــــك
یان ناردنی بابەتێـــــك .پەیوەندی بکـــــەن بەسەرنووسەرەوە بەم ناو نیشانە . :
دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری ـ بەڕێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر ـ یان ناونیشانی سەرەوە .
یان بە ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی گۆڤار : **2527054** یان مۆبایلی سەرنووسەر **07504618045**

**یان پۆستي ئەلکترۆنی :**

**E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com**
**aras_co_center@yahoo.com**



**خاوەنی ئیمتیاز**
**وەزیری ڕۆشنبیری**

**سەرنووســــەر**
**ئاراز مەولود ڕەشید**

**بەڕێوەبەری نووسین**
**فاخر مەحمود میرزا**

**بەڕێوەبەری هونەری**
**سالم بابە شێخ**

**دەستەی نووسەران**
**ڕێناز ئەردەڵان بەکر**
**کاوە سلیمـــان**
**شاخەوان عمر حسن**

**سەرپەرشتی چاپ**
**ئەهرۆ مەحمود**




**تێبینی :**
بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر تکایە ڕەچاوی ڕێسـای نووسین بکەن لەسەر کۆمپیوتەر بەدانانی خاڵبەندی نووسین بەم شێوەیەی لای خوارەوە

1. لـە پێش فاریـزە، هیـــچ Spase نەبێت لە دوای فاریـزەش بـا یەك Spase هەبێت.
2. لە پێش خاڵ [illegible] Spase [illegible] Spase [illegible]

# پێرســـــت

# ئەو بەرنامانەی کە لە ناو سیدی ژمارە ١٧ دا هەیە

ئا : هێرش ئسماعیل

## Internet Tools




- Al shabah
- Anonym Sender
- Cookie Pal
- Dumeter3.2
- ENGEBT
- FAMILY
- Flash Player 6.0
- Fox Mail 4.1
- Get Right.5.0
- GO Zilla 4.11
- Google Search Tool 3.3
- Hot mail options
- Incredi Mail XE builds 618
- Jap2
- Mail watcher
- Microsoft Internet Explorer 6.0 FULL
- MSN6
- MSN MESSENGER 5
- Net Time
- Opera V7.2 Full
- Panic ware Surf Pal
- Poco Mail
- Qualcomm Eudora Pro 5.0
- Ring Central 4.4
- Socks Cap 2.3
- Web ZIP 5.0
- Where Is IP 2.0
- Zone Alarm 3.5

## CD-R Writer




- Clone cd 4.2.0.2
- Nero 6

## Multimedia Tools




- DB power AMP
- DFX 6 for Windows Media Player 9
- DFX 6.0 for RealPlayer and Real Juke box
- Div X 5.02 Pro
- Jet Audio 5 Plus
- MUSICMATCH Jukebox
- Power player 5.0 SE
- Quick Time Installer v 6.0
- Real One Player v2.0 Gold
- Sound Edit Pro v 1.2
- Super Audio Converter v3.2
- VCD XP
- Win amp Full
- Windows Media Encoder 9.0 xp
- Windows Media Player 9 Codec Update
- Windows Media Player 9.0 for Win all
- Win DVD Recorder & Player Platinum
- Win MPG Video.Convert.v1.5

- Power Quest Boot Magic 8.0
- Recover 4all 2.9
- Registry Crawler
- Serials 2000 7.1
- Smart Type Assistant 2003
- SPEEDER
- Start ED 4.04
- System Mechanic V3.7c
- Virtual CD v4.04
- Window Blinds 3.0 Enhanced
- Windows XP Home Startup Disk
- Windows XP Pro Startup Disk
- Win Driver Ghost 2.0

## Graphic Tools




- ACD See 5.0 Full Arabic
- Adobe Acrobat 6.0
- Axial is Icon Workshop 5.0
- Compo Pic Pro 6.21
- COOL 360 1.0 + Update Patch
- Easy 3D Creator
- Gland a
- MMB
- Morph Studio 1.0 SE
- photo2vcdpro 1.82
- Real Draw
- Screen Saver Slide
- Simply 3D 2.0
- Swift 3D 1.0
- Video Studio 7.0
- Video to Flash Arabic

## Zip Tools




- ACD Zip 1.0
- Archive xp
- Win ACE 2.2
- Win zip 9.0
- WRAR.320
- Zip Wave 1.3

## Utilities




- Add Remove Pro v2.03
- Beautiful Calculator
- Camtasia3
- Cruising Time
- Desktop Architect
- DirectX9
- DirectX 9 Control Panel
- Drive cleanser 6.0
- Dr Speed
- Em Editor Version 3.26
- Hide Folders 2.1
- PASS KIT5.5

# بەرنامەیەك بۆ خەزن کردنی فایلی جۆری فلاش

ئا: پێستون عمر

دیزاین و نەخشە سازی سایتەکانی ئەنتەرنێت زۆر پێش کەوتن وە رۆژ بە رۆژ پێشتریش دەکەون دوای ئەوەی کە پەرەکانی وێب بە چەندان جۆر بەرنامەی دیزاینی جۆارو جۆر دروست دەکرێن و وە ئەم پێشکەوتنەش گەیشتە ئەو رادەی کە پەرەکانی وێب چەندان شێوەی جیاوازی دیزاین بە دروست کراوی چەندان بەرنامەی جیاواز لەناو یەك روبەری سایتێکدا دروست بکرێن لەناو ئەم بەرنامانەدا ئێستا لە سەر پەرەکانی وێب جوانترین پەری وێب کە دیار دەکەوێت بریتیە لەو پەرانەی کە بە بەرنامەکانی فلاش دروست دەکرێن . بێگومان ئەو کەسانەی کە کاری دیزاین دەکەن بە بەرنامەی فلاش زۆر بەتواناو زۆر هونەرمەندانە کاردەکەن و ماڵپەرکان دەرازێنەوە ئەمەش وای لە بەرنامە سازەکان کردوە کە بەرنامەیەك هەبێت بۆ خەزن کردنی فایلەکانی فلاش بۆ ناو کۆمپیوتەر بەمەش چەندان بەرنامەی تایبەت دروست کراون گرینگترینیان بریتیە لە (Save Flash) کە دەتوانێت زۆر بەئاسانی تەنها بەیەك کلیك کامە بەشی فلاش لەناو هەر سایتێك بێت خەزنی بکەیت هەنگاوەکانە ئەم بەرنامەیە بەم شێوەیە دەست پێدەکات . دوای ئەوەی بەرنامەکەت دامەزراند لەناو کۆمپیوتەر ئەوا خۆکاری دەچێتە سەر بەرنامەکانی پەرە هەڵدەرەوەکان ئینجا بۆ ئەوەی ئەم خزمەت گوزاریە لەسەر هەموو سایتەکان کار بکات پێویستە لەسەر شریتی (Address Bar) کلیکی راست بکەین دەبینین کۆمەڵێك خزمەت گوزاری دەردەکەون یەکیان (Save Flash) بروانە وێنەی (١) ئێمەش یەکسەر کلیك لەسەری دەکەین دوو رێگاش هەیە بۆ خەزنکردنی هەموو فایلەکانی فلاش لەم پەرەدا ئەویش بە کلیك کردن لەسەر هێمای بەرنامەکە کە رەنگێکی زەردی هەیە یەکسەر فایلەکە خەزن دەکات و دوایی داوای دەست نیشان کردنی شوێنی خەزن کردنت لێدەکات. وەك



وێنە ١

هێمای بەرنامەی خەزنی فلاش دیاردەکەوێت کە رەنگێکی زەردی هەیە وە ئەگەر ئەم سایتە هیچ فایلی فلاشی تێدا نەبوو ئەوا رەنگی رەش و سپی دەردەکەوێت بەلام رێگای دووەم بریتیە لە کلیکی راست و هەلبژاردنی سەیڤ فلاش . بۆ ئەم مەبەستەش دوای کلیك کردن لە سەر هێمای بەرنامەکە بۆکسێك دێت بروانە وێنەی (٢)



وێنە ٢

لەم بۆکسەدا کلیك لەسەر (Setting) دەکەین دواتر بۆکسێکی تر دێت بروانە وێنەی (٣)



وێنە ٣

پاشان ئێمە کلیك لەسەر (Enable flash right – click menu) بەمەش کردارەکە زۆر ئاسان دەبێت چونکە ئێمە هەر فایلێکی فلاشمان مەبەست بێت دەتوانین بە تەنیا خەزنی بکەین ئەویش بە کلیکی راست لەسەر هەر فایلێکی فـلاش بروانە وێنـەی (٤)



وێنە ٤

پاشان بۆکسێك دێت بروانە وێنەی (٥) دوایی تەواو دابەزینی کلیك لەسەر سەیڤ دەکەین. بەمەش کردارەکە کۆتایی دێت .



وێنە ٥

# زنجیرە(١١) لە بەرنامەی ADOBE PREMIER

ئا: گەردی

## جولاندنی دیمەن بەشێوەی تەواو

لەزنجیرەی رابردوو باسی ئەوەمان کرد کەوا چۆن کاریگەری زیاد دەکەینە سەر دیمەنەکان و هەروەها سوڕاندنی، دوای نمایش کردنی دیمەنەکە هەلدەستین بەوەستاندنی نمایشەکە ، پاشان دوگمەی یەکەمی جولە لەبەشی Time (ژمارە ١) دادەگرین بۆ هەلبژاردنی ، بەهای لابردنی لەتەك Info دەگۆرین و دەیکەین بە (سفر) . (ژمارە ٢) ، ئەم بەهایە واتا دیمەنەکە لەناوەراستی پەنجەرەی رووداو دەبێت کرداری بینین ئەنجام دەدەین لەسەرەوەی پەنجەرەکە . (وێنەی ١) .

١. هەمان فەرمان لەسەر کلیلی کۆتایی ئەنجام دەدەین . (وینە ٢) .
٢. ئامانج لەهەردوو هەموار کردنی سەرەوە هەڵوەشاندنەوەی جولەی ئاسایی دیمەنەکەیە ، هەروەها دەتوانین پاش هەلبژاردنی هەردوو کلیلەکە دوگمەی Centerداگرین بۆ بەدەست هێنانی هەمان ئەنجام . (وینەی٣)
٣. ئیستا بۆ دروستکردنی جولەی تایبەت، کلیلێکی نوێ دروست دەکەین لەناوەراستی بەشی کات Time ، نیشانەی ماوس لەسەرووی راستەی کاتی دیمەنەکە دەجولێنین تا نیشانەکە دەگۆرێ بۆ نیشانەیەکی سێ گۆشەیەکی رەشی بچوك. (وێنە٤)
٤. نیشانەکە کلیك دەکەین بۆ دروستکردنی کلیلێکی نوێ وە رای دەکێشین بۆ ناوەراستی دیمەنەکە ٥٠٪ ، بە دروستکردنی ئەم کلیلە و لەم شوێنە دیمەنەکە بەبێ جوولە دەهێلێتەوە تا نیوەی کاتەکە تێپەر دەبێت . ( وێنەی٥)
٥. ئیستا کلیلی کۆتایی هەڵدەبژێرین . (وینە ٦)










ماوسەکە بجولێنە تا ئەم نیشانەیە بەدەردەکەوێ و پاشان کلیکی بکە بۆ دروست کردنی کلیل












٦. گۆشەی دیمەنەکە دەسورێنین بۆ گۆشەی ٢٥٠پلە ، ئەم بەهایە لەخانەی Rotation دەنوسین ، هەروەها دەتوانین لەجیاتی نوسینی ژمارەی گۆشەکە بەنیشانەکە بری گۆشەکە دیاری بکەین . (وینە ٧)

٧. هەروەك لەسەروە باسمان کرد دەبینین دیمەنەکە تا ناوەراستی هیچ جوولەی نیە و لەناوەراستی دا دەست بەسوڕان دەکات بەدەوری خۆی. (وینە ٨)

٨. ئیستا دیمەنەکە وا لیدەکەین لەگەل سوراندا بەرە بەرە بۆدواوە بکشێتەوە و بچوك بێتەوە لەکلیلی کۆتایی جوولە بەهای zoom دەکەین بە سفر. (وینە ٩)

٩. دوای ئەوەی دیمەنەکە دەستی بەسوڕان کرد و بەرەو دواوە ڕۆیشت ئیستا هەڵدەستین بەهەموار کردنێکی تر ئەویش سوڕان و کێشانەوە بەرەو دواوەی دیمەنەکە بەرەو یەکێ لەگۆشەکان پێش ئەوەی بەتەواوی بزر بێت ئەم جوولەیە لەدوای ٧٥٪ لەکاتی دیمەنەکە دەست پێ دەکات وەپاش رۆیشتنی ٥٠٪ جوولەی سوڕان و رۆیشتن بەرەو دواوە دەست پێ دەکات . ئیستا کلیلێکی نوێ دروست دەکەین لەکاتی ٧٥٪ لەکاتی دیمەنەکە . (وینە ١٠)

١٠. کلیلەکە دەجوولێنین بۆ کۆتایی .(وینە ١١)

١١. لەپەنجەرەی سەرەوە کلیلی کۆتایی بەرەنگی سوور رەنگ کراوە ،تەنها دەیگرین و رایدەکێشین بۆ گۆشەی سەرەوەی لای راستە . (وینە١٢)

١٢. دەتوانین دیمەنەکە لار بکەین ، ئەمەش سوود بەخشە بۆ زیاد کردنی زیاد کردنی تێکست لە تەك دیمەنەکە ، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش پاش هەڵبژاردنی جوولەی گونجاو سووچەکانی دیمەنەکە لە خانەی Distortion دەستکاری دەکەین تا دەگەینە کاریگەریەکی گونجاو ، وەدتوانین کرداری بینینی بۆ ئەنجام بدەین لە پەنجەرەی بینی تابلۆکە . (وێنەی ١٣).







وێنەی ٧







نیرە ڕاکیشە

وێنەی ٩







وێنەی ١٢



# گەڕاندنەوەی وێنەی یەدەك لە بەرنامەی (NORTON GHOST) لە ڕێگای (دۆس)

## زنجیرەی دووەم لە دۆسەوە

ئا: ئیسماعیل خەلیل ئاکرەیی

لە زنجیرەی پێشوو باس لە چونیەتی دروست کردنی وینەی یەدەکمان کرد لە بەرنامەی ( Norton Ghost) لە ڕێگای (Dos ) دۆسەوە، ولەم زنجیرەیەدا باس لە چونیەتی گەڕاندنەوەی وێنەی یەدەك ( Restore ) ئەکەین هەر لە هەمان ڕێگاوە، لەسەرەتا ئەبێ سیدی ( CD ) بەرنامەکەمە بینین کە لە ڕێگای دۆس کار بکات و ئەیخەینە ناو (CDROM) و کۆمپیوتەرەکەمان ریستارت ئەکەین، پاشان بەرنامەکە بکەوە هەر وەکو پێشوو لە ڕێگای دۆسەوە ئنجا بچۆرە سەر ڕووبەری بەرنامەکە و بچۆرە سەر لیستی بەرنامەکە و کلیکی لەسەر بکە و بچۆ بۆ سەر فەرمانی ( Local )، و پاشان لیستێکت بۆ دەرئەکەوێت کە بریتیە لە سێ هەلبژاردە، تۆ هەلبژاردەی دووەم کەنوسراوە ( Partition ) هەڵبژێرە و کلیکی لەسەر بکە، لەپاشان لیستێکی تر دەرئەکەوێت ئەویش سێ هەڵبژاردەیە، تۆ هەڵبژاردەی سێیەم کەنوسراوە ( From Image ) هەڵبژێرە و کلیکی لەسەر بکە بڕوانە وێنەی (١)



وێنە ١

پاشان چوارگۆشەیەك دێت لەناو چوارگۆشەکە و لەخانەی ( Look in ) ئەو بەشە هاردە دیاری بکە کەپێشتر وێنەی یەدەکەت لەناو دانابوو، ئیمە پێشوو لە بەشی ( D ) لە هاردەکەمان دانابوو، کەواتە بەشی ( D ) هەڵدەبژێرن و وێنەی یەدەکەکە دیاری دەکەین و کلیك لە سەر فەرمانی (open) بکە بڕوانە وێنەی (٢)



وێنە ٢

پاشان چوارگۆشەیەك دێت زانیاری لە سەر وێنەی یەدەكەكەت ئەداتــێ، لەناویدا كلیــك بكە لە سەر فەرمانی ( OK ) بڕوانە وێنــەی (٣)




وێنە ٣

پاشان چوارگۆشەیەكی تر دێت لەناویدا هاردەكەت هەڵبژێرە ئەگەر دوو هاردت هەبوو لەناو كۆمپیوتەرکەت بەڵام ئەگەر یەك هارد بوو تەنها كلیك لەسەر ( OK ) بكە بڕوانە وێنەی (٤)




وێنە ٤

پاشان چوارگۆشەیەكی تر دێت لەناویدا ئەو بەشە هاردە هەڵبژێرە كە كرداری گەڕاندنەوەی وێنەی یەدەكەكە لە ناویدا ئەكەیت كە بەشی ( C ) یە لە هاردەكە كە ناسراوە بە ( Primary) كە لە خانەی سەرەوەی چوارگۆشەكە دانراوە، تۆ خانەكە دیاری بكە و كلیك بكە سەر ( OK ) بڕوانە وێنەی (٥)




وێنە ٥

پاشان چوارگۆشەیەکی تر دێت دوو فەرمانی تێدایە، بۆ تەواو کردنی کردارەکە تەنها کلیك لەسەر فەرمـــانی ( Yes ) بکە بڕوانە وێنەی (٦)



وێنە ٦

و لەکۆتایی هەنگاوەکان نۆرتون گۆست دەست بە کرداری گەڕاندنەوەی فایلەکانی وێنەی یەدەکەکە ئەکات و کردارەکە نزیکی (١٥) خولەك ئەخایەنی بڕوانە وێنەی (٧) پاشان کۆمپیوتەرکەت ریستارت ئەبێتەوە، ئەبینی ویندۆزەکەت وەکو پێشوو کە یەکەم جار وێنەی یەدەکت بۆ کردبوو هەر بە هەمان شێوە سیستەمەکەت بۆ دادەمەزرێنێتەوە واتا بەو شێوەیەی کە خۆت پێشتر ئامادەت کردبوو بەم شێوەیە کۆتایی دێت بە دانانەوەی ئەو یەدەکەی کە پێشتر ئامادەت کردبوو هەر لە دانانەوەی سیستەم وبەرنامە و پێناسەکان و شتەکانی تریشەوە بەو شێوەیە دەگەڕێتەوە کە لە سەرەتاوە چۆن وێنەی یەدەکەکەت درووست کردبوو



وێنە ٧

# درێژە زنجیرەی بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ پرۆ
# چۆنیەتی دانانی جوڵە Effect لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ پرۆ

ئا : فاخر مەحمود میرزا

وەك لەوانەکانی پێشوو ئاماژەمان بەو بەرنامەیە کرد کەوا چەند کارێکی زۆر گرنگ ئەنجام دەدات لەم بەرگەشدا هەوڵدەدەین کەوا کارێکی گرنگی لێ باس بکەین ئەویش چۆنیەتی دانانی جوڵە یان (Effect)ە لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ بێگومان هەر وێنەیەك یان هەر پارچە ڤیدیۆیەك کەوا کاری مۆنتاجی لەسەر بکرێت ئەوا پێویستی بە جوڵە یاخود ئیفێکت دەبێت لە نێوانیان ئەم کارەش بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت سەرەتا بەرنامەکە دەکەینەوە لەسەرەوە لەلای ڕاست لیستێك هەیە بەناوی Production Library کەوا جوڵەکانی تێدایە دیارە هەروەها لەژێر ئەودا نوسینێکی تر هەیە بەناوی Transition Effect بەماوس کلیکی لەسەر دەکەین هەر لەم لیستەوە چەند نووسینێك زیاد دەبێت کە هەریەکە و تایبەتە بەکارێك بەم شێوەی کە لەم وێنەیەدا ئاماژەمان بۆی کردووە واتا وێنە ژمارە ١



وێنە ١

بەشی یەك و بەشی دوو هیچ کارێکمان پێیان نابێت بەڵام چوارەکەی کۆتایی گرنگن یەکەمیان Transition Effect هەڵدەبژێرین بەماوس کلیکی لەسەر دەکەین دەبینین کە چەند جوڵەیەکی زۆر دەکەوێتە بەرچاو ئێستا ئەگەر بێت و دوو وێنە یاخود دوو پارچە ڤیدیۆ لەژێر یەك دابنێین و ئینجا جوڵەیەك هەڵبژێرین بێنینە ناوەراست دەبینین لیستێك پەیدا دەبێت وەکوو وێنەی ژمارە ٢ پاش دانانی جوڵەکە بەم شێوەیە وێنە ٢



وێنە ٢

ئینجا ok دەکەین دەبینین دووپارچە وێنەکە بەجوڵەیەکی جوان دەکەونە سەر یەکتر بەشی دووەمیان بریتیە لە Movig Path ئەم جۆرەیان دەچێتە سەر وێنە یاخود ڤیدیۆ واتا جوڵەی یەکەم کە باسمان کرد دەچێتە نێوان دوو وێنە یاخود دوو ڤیدیۆ بەڵام ئەمەیان دەچێتە سەر دوو وێنە یاخود دوو ڤیدیۆ پاش ئەوەی جوڵەیەك هەڵدەبژێرن و بەماوسەکە جوڵکە دەهێنینە سەر ڤیدیۆ دیسان لیستێك پەیدا دەبێت و OK دەکەین وەکوو لە وێنە ٣ دا دیارە




وێنە ٣

ئەو جارە دەبینین وێنەکە بەتەواوی جوڵەکەی وەرگرتوە بەشی سێ یەمیان بریتیە لە Video Filter ئەوەیان وەك بەشی دووەم کە باسمان کرد دەچێتە سەر ڤیدیۆکە و بە هەمان شێوە کارەکان دووبارە دەکەینەوە وێنە ٤ وە ئەوی تریشیان تایبەتە بە خۆش کردنی دەنگ.




وێنە ٤

# بەرنامەی ProShow Gold

ئا: عبدالله مولود

بەرنامەیەکی زۆر بەهێزە بۆدروستکردنی پارچە ڤیدیۆ و سلاید شۆ و ڤیدیۆ بۆسەر ماڵپەرەکانی ئەنتەرنێت لەرێگای ئەوبەرنامەیە دەتوانیت چەندەها شێوەی ڤیدیۆ بەجولە دروست بکەیت هەروەها ئەگەر بتەوێ ماڵپەرەکانی سایتی خۆت برازێنیەوە بەپارچە ڤیدیۆی جوان و هەروەها بەقەبارەیەکی بچوك هەروەها رەنگاورەنگی زۆر جوان ئەوا بەرنامەی ProShow Gold باشترین و ئاسانترین بەرنامەیە بۆ ئەوکارانە من خۆم زۆربەی لاپەرەکانی سایتەکەم بەبەرنامەی ProShow Gold رازاندۆتەوە زۆربەئاسانی کاری لەسەردەکەم بەراستی بەرنامەکی زۆر بەسودە دەتوانی چەند وێنەیەك کۆبکەیتەوە بەیەکەوە بیان کەیت بەتراکێکی دەنگ و وێنە هەروەها دەتوانی دەنگێکیش بخەیتە بن پارچە ڤیدیۆکە هەروەها دەتوانی لەرێگای ئەو بەرنامەیە سلاید شۆ دروستبکەیت بۆنمونە تۆ چەند وێنەیەکت هەیە دەتەوێ وێنەکان بەشێوەی ڤیدیۆ یەك بەدوای یەك بەجولەیەکی جوان دروست بکەیت بۆ کارکردن لەسەر ئەوبەرنامەیە زۆرئاسانە سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان سەیری لای چەپی بەرنامەکە بکە لەسەرەوە بۆشاییەك هەیە لەسەر بۆشاییەکە Folders نووسراوە وێنە ١




وێنە (١)



لـەناو ئـەو بـۆشـایـیـە هـەمـوو هاردەکانی دیاری کردوە تۆ ئەو وێنەی هەلت گرتوە لەناوکام هاردە بەماوس دێیت لـەناو بۆشاییەکە ئەوهاردە دیاری دەکەیت ڕاستەو خۆ وێنەکان بەدیاردەکەون پاشان کام وێنەت بویَ لەوێنەکان بەماوس ڕایدەکێشەیت بۆ بۆشای خوارەوە بەم شێوەیە وێنە ٢

وێنە ( ٢ )

ئینجا لەسەرەوەی بەرنامەکە لەناوەراست ڤیدیۆ نوسراوە یەکجار کلیکی لەسەردەکەیت لیستێك دەبێتەوە لـەسەرەوەی لیستەکە لەناو بۆشایەك vcd نوسراوە کلیکێکی لەسەر بکە چەند ئیکستیشنك دەبێتەوە وێنە ٣




وێنە ( ٣ )

ئینجا بتەوی بەچی خەزن بێت خۆت هەڵی دەبژێریت پاشان لەخوارەوە Great هەیە کلیکێکی لەسەربکە لیستێکی تر دەبێتەوە پێت دەڵێ لەکوێ خەزن دەکەیت تۆش ناوێکی بدێ و لەهاردێك خەزنی بکە بەم شێوەیە وێنە٤



وێنە ( ٣ )

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەرێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر وئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەد دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر ودەتوانن سەردا نمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە :

هەرێمی کوردستانی عیراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیك هۆڵی زەرد ، یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە : مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس ، هەولێر بەرامبەر قەلا ، باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی : ( ٢٢٢٢٧٢١ ) مۆبایل : ( ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ ) یان پۆستی ئەلکترۆنی

E-MAIL: COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM
E-MAIL: ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

**تێبینی:**

- هەر بابەتێك بلاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت.
- هەر بابەتێك لە شوێنێك یان ڤۆڤارێکی تری کوردی بلاو بکرێتەوە ئێمە بلاوی ناکەینەوە.
- بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بلاو کردنەوە ئەوا ناگەرێتەوە.
- هەر کەسێك بابەت ئەنێری بۆ بلاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسك یان فلاش میموری بێت وێنەی روونکەرەوەکان بە جیا لە نێو فۆلدەرێك دا دابێت وبابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.

# AutoCad

## زنجیرەی ( ٩ )

ئا / غزالە یونس

سەرەتا بەرێزانم ئەم زنجیرەییەی ئەمڕۆ تەواو کەری زنجیرەکانی ترە بەلام لە زنجیرەی ئەمرۆماندا دە چینە سە ر لیستێکی نوێ ئەمیش لیستی رێکخستنە(Modify) لەم لیستەدا ئەو ئایکۆنانەی تێدایە کە بە هۆیانەوە دەتوانین دەست کاری ئەو وێنانە بکەین کە پێویستیان بە دەست کاری کردنە .جا لێرەدا ئێمە یەکە یەکەی ئایکۆنەکان باس دەکەین .




وێنە ١

**Offset-1** : بـەرێزانم ئـەم فەرمانـەش هـەر لـە لیـستی (رێکخستنە) دەتوانین بە هۆیەوە وێنەکانمانی پێ دەست کاری بکە ین .وە دەتوانین بانگی بکەین لە چەند شوێنێك :-

١- لە لیستی **Modify** دەچینە سە ر **Offset** کلیکی لە سە ر دەکە ین (وێنە ی ١).




وێنە ٢

٢- لـە شـریتی کەرستـەکان کلیـك لەسـەر **Offset** دەکەین .

جالێرەدا بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت بازنەیەکی دیاری کراو دروست بکەین بمانەوێت ئەم فەرمانەی لەسەر جێبەجێ بکەین ئەوا سەرەتا بانگی فەرمانەکە دەکەین پاشان داوای ئەو دووریە دەکات کە دەمانەوێت بیکەین بـۆ نموونـە دەلێـین ١٠ پاشـان **Enter**ئینجا لـە شـریتی زانیارییـەکان داوا دەکـات وێنەکـەت دەسـت نیـشان بکـەیت کەدەتـەوێتOffset بکـەیت تـۆش کلیکی لەسەر بکە ئینجا پاش دەست نیشان کردن داوا دەکات وێنەکە لەکام لاوە Offset بکات تۆش بە پێی وێنەکەت کلیك لەولاوە بکە کە دەتەوێت **Offset** بکەیت (وێنەی ٢ ).

لێرەدا ئەم فەرمانە دەتوانیت بۆ زۆر وێنەی تر بەکاری بهێنی بۆ نموونە ( وێنەی ٣) وێنەیەکە تۆش دەتوانیت ئەنجامی بدەیت .

## ٢- Array

: بە ڕێزانم ئەم فەرمانەش هەر لە لیستی (ڕێکخستنە) دەتوانین بە هۆیەوە وێنەکانمانی پێ دەست کاری بکە ین لە ڕووی ژمارەوە بۆ نموونە ئەگەر وێنەی چوار گۆشەیەکمان هەبێت وەك ئەوەی بەرەنگی زەرد وێنە کراوە بمانەوێت وەك ( وێنەی ٤) ی لێ بکەین ئەوا بە یاریدەی ئەم فەرمانە درووستی دەکەین . و دەشتوانین بانگی بکە ین لە چەند شوێنێك وەك هەموو فەرمانەکانی تر :-

١- لە لیستی **Modify** دەچینە سە ر فەرمانی **Array** و کلیکی لە سە ر دەکەین .

٢- لە شریتی کەرستەکان کلیك لە سەر **Array** دەکەین . ئەوا پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە( وێنەی ٥) .

بەڕێزانم لەبەشی سەرەوە دوو هەڵبژاردە هەیە بۆ نموونە ئەگەر (**rectangular Array**) مان دەست نیشان کرد لێرەدا ئەم فەرمانە ئەگەر بمانەوێت وێنەکەمان ستوون وریزی ئاسۆیمان هەبێت ئەوا ئەگەر وێنەیەکمان وەك وێنەی ٤) درووست کرد سەرەتا لاکێشەیەکی بچوکمان درووست کرد بەرێگاکانی درووست کردنی وێنە پاشان بانگی فەرمانەکە دەکەین هەڵبژاردەی یەکەم (**rectangular Array**) دەست نیشان دەکەین ئینجا لەخوارەوە ژمارەی ڕیزەکان **Raw** دەست نیشان دەکەین بۆ نموونە دەیکەین بە ٦ ڕیز پاشان ژمارەی ستوونەکان **Columns** بۆ نموونە ئەمیش دەکەین بە ٦ پاشان لەبەشی خوارەوەدا داوای دووری نیوان(**Raw Columns** ) دەکات تۆش بەپێی وێنەکەت بۆ دووریەکی ژمارەیەك دابنێ بۆ نموونە ٥٠و ٥٠ پاشان لە بەشی سەرەوەی دەستە ڕاستی پەنجەرەکەت **Select object** هەیە بۆ دەست نیشان کردنی لاکیشەکەت .لیرەدا پاش ئەوەی لاکێشەکەت دەست نیشان دەکەیت Enter دەکەیت بۆگەڕانەوەی پەنجەرەکەت پاشان یان **Preview** دەستنیشان دەکەیت بۆئەوەی دەستکاری وێنەکەت بکەیت ئەگەر بەدڵت نەبوو ئەوا بە کلیك کردن لەسەر okوێنەیەکی وەك (وێنەی ٤ ) درووست دەبێت .


وێنە ٣


وێنە ٤



وێنە ٥

بـەرێزانم بـەڵام ئـەم جارەیـان بمانـەوێت وێنەیـەك بەشـێوەی بازنـە درووسـت بکـەین وەك( وێنــەی ٧) سەرەتا بازنەیەك دروست دەکەین وەك ئەوبازنەیەی بەرەنگی مۆر وێنە کراوە پاشان بانگی فەرمانەکە دەکەین ئەم جارەیان هەڵبژاردەی دووەم هەڵدەبژێرین Polar array هەڵدەبـژێرین (وێنــەی٦) لێـرەدا لەبەشی سەرەوەدا دەستنیشانی وێنەکەمان دەکەین کەنووســـراوەSelect object پاشـــان چـــوار گۆشـــەیەکی بـــچووك هەیـــە کەنووســـراوە Center Point دەست نیشان دەکەین


وێنە ٦

بەم شێوەیە پەنجەرەکە نامێنێت تۆ ش بەشێوەیەکی هەرەمەکی کلیك لەدووری بازنەکەت بکە بۆ دەست نیشان کردنی چەقی ئەو بازنەیەی کە دەتەوێت وێنەکەتی بەدەوری بسوڕێتەوە


وێنە ٧

پاشـان Enter دووبـارە دابگـرەوە پەنجەرەکـە دەگەڕێتـەوە ئـەم جـارە لەبەشـی خـوارەوە داوای ژمارەی ئەو بازنانەیە دەکات کە دەتەوێت درووستی بکـەیت تـۆش بنووسـە ١٥ لـەژێر ئـەو داوا دەکـات بازنـەکان بـەدەوری بازنەیـەکی تـواو یـان نیـوە بازنـە بسوڕێنەوە تـۆش بنووسـە ٣٦٠ پلـە واتـە بازنـەی تـەواو پاشان OK بکە( وێنەی ٧) مان بۆ دروست دەبێت.بەرێزانم( وێنەی ٨) وێنەیەکە بۆتانم دروست کردووە ئێوەش دەتوانن بۆ خۆتان دروستی بکەن



وێنە ٨

# بەکارهێنانی نزم بوونی سەرەتاو نزم بوونی کۆتایی لەبەرنامەی COOL EDIT PRO کول ئیدت پرۆ

ئا : کاوە سلێمان

بەڕێزان وەك لە هەموو زنجیرەکان باسمان لەگرنگیەکانی ئەم بەرنامەیە کرد کە توانایەکی ئەوتۆی هەیە لەبواری دەنگدا هەروەها لەم زنجیرەیەشدا باس لەسودێکی تری ئەم بەرنامەیە دەکەین ئەویش چۆنیەتی بەکار هێنانی نزم بوونی سەرەتاو کۆتایی دەنگێك یان گۆرانیەك کە بە فێد ناو دەبرێت و ئێستاش پێناسەیەکی ئەو ناوەتان بۆ دەکەین ، سەرەتا فێد چی یە؟ فێد بریتیە لە نزمەوە بۆ زیاد بوون یاخود بە پێچەوانەوە لە بەرزەوە بۆ نزم بوون واتا ئەگەر ئێمە دەنگێکمان هەبێت لەناو ئامێری کۆمپیوتەرەکەمان ئەم دەنگە سەرەتاکەی لەنزمەوە دەست پێناکات هەروەها کۆتاییەکەشی سەبر سەبر نزم نابێتەوە واتا یەکسەر دەست پێبکاو لەناکاویش کۆتایی بێت بێ ئەوەی دەنگەکە سەبر سەبر نزم بێتەوە چۆن دەتوانین فێد بۆئەم دەنگە دابنێین لەم کاتە پەنا دەبەین بۆ بەرنامەی Cool Edit Pro سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان ئەو دەنگەی پێویستمانە دەیهێنینە ناو بەرنامەکە لە ڕێگای file وە دەچینە سەر فەرمانی open ئینجا سەرەتای ئەم دەنگە پێنج سانیەك دیاری دەکەین بەماوس پاشان دەچینە سەر Favorites جارێك بەماوس کلیکی لەسەردەکەین دەبینین چەند شتێك لە لیستەکە زیاد دەبێت لێرەدا ئێمە کارمان بەدوو شتە یەکەمیان Fade In و ئەوەی تریان Fade Out وەکوو وێنەی وێنە ١


وێنە ١

سەرەتا هی یەکەمیان هەڵدەبژێرین Fade In سەیردەکەین دەنگەکە سەرەتاکەی لەنزمەوە دەست پێدەکات وێنە ٢


وێنە ٢

پاشان دێینە کۆتای دەنگەکە بە ماوس کۆتایەکەی پێنج سانیەك دیاری دەکەین وێنە ٣




وێنە ٣

ئەم جارەیان Fade Out هەڵدەبژێرین سەیری کۆتایی دەنگەکە بکە بەرەو نزمی دەڕوا ئینجا کۆتایی پێدێت وێنە٤ پاشان دەنگەکە هەڵدەگرین لەڕێگای FILE دەچینە سەر فەرمانی SAVE AS و پاشان بە ناوێکەوە لە ناو کۆمپیوتەرەکەدا خەزنی دەکەین بۆ ئەوەی دواتر بتوانین ئەو بەشە دەنگیە یان ئەو گۆرانیە بەکار بێنین بەو شێوەیەی کە خۆمان پاراستومانە .




وێنە ٤

# Visual Business Cards 3.3
# بەرنامەیەکی تایبەت بۆ دروست کردنی کارتی کەسی و کۆمپانیاکان

ئا / گۆران شەقلاوەیی

بەهۆی ئەم بەرنامەیەوە دەتوانین هەڵسین بە دیزاین کردنی کارتێکی کەسی یاخود بۆ کۆمپانیا و دەزگاکان، وە دوایی پرێنت کردنی بەهۆی پرێنتەرەکەتەوە بە وەرەقەی ئاسایی یاخود تایبەت بە کارتەکان.

## ڕێگای کارکردنی بەرنامەکە:

شیکردنەوەی ووردی کارکردنی بەرنامەکە بەپێ ی ئەو ژمارانەی کە لەسەر وێنەکە دانراون .




١.بـــۆ وازهێنـــان لەهـــەر هەڵبـــژاردنێك کەهەڵبـــژێردراوە ، وەگەڕانەوە بۆ بەکارهێنانی نیشاندەرەکە .

٢.بۆ نووسین لەیەك دێڕدا .

٣.بۆ نووسین لەچەندین دێڕدا کەلەتەك یەکەوە بن .

٤.بـەکارهێنانی ڕەمـز لـەنێو کارتەکـەدا، وە دەتـوانین ڕەمـزی تایبەت بەکاربهێنین بۆ کارتەکە، ئەگەر ئەو ڕەمزانـەمان بـەدڵ نـەبوو کەلـەنێو فۆڵـدەری بەرنامەکـەدا هـەن، ئەمیـش بەزیادکردنی ڕەمزەکە بۆ نێو فۆڵدەری ڕەمزەکان .

٥.بەم هەڵبژاردنانە دەتوانین شێوەی دەرەوەی کارتەکە دیاری بکەین، واتە چوارگۆشەیی بێت یاخود هێلکەیی بێت یاخود چوارگۆشەیی بەبێ بوونی گۆشەی لاکان .

٦.بۆ هێنانی هێڵێکی ستوونی جیاکەرەوە .

٧.بۆ دانانی باگراوند بۆ کارتەکە یاخود بۆ بەشێکی کارتەکە، ئەگەر باگراوندی بەرنامەکەمان بەدڵ نەبوون ئەوا دەتوانین باگراوندی تر بەکاربهێنین، ئەمیش بەزیادکردنی باکگراوندەکە بۆ نێو فۆڵدەری باگراوندەکان لە بەرنامەکەدا .

٨.دانانی چەندین شێوە بۆ سەر کارتەکە، وەکو ئەستێرەو ئالاّ، وە هەروەها دەست گرتنێکی تەواو بەسەر ڕەنگ و سێبەردا .

٩.دانانی نووسین لەسەر کارتەکە، بەلاّم ئەم هەڵبژاردەیە پاڵپشتی زمانی کوردی ناکات .

١٠.دانانی نووسین بۆ سەر کارتەکە، ئەمەیان پاڵپشتی زمانی کوردی دەکات ، وەلەگەڵ دەست بەسەراگرتنی فۆنت و ڕەنگ و ...هتد .

١١.زیادکردنی نووسین بەشێوەی بازنەیی .

١٢.خوێندنەوەی مەلەفی پرسیارە دووبارەکراوەکان، بۆ کاری بەرنامەکە و چۆنیەتی کردارەکانی .

١٣.دانانی باگراوندێکی کاتی بۆ سەر کارتەکە، وەکو شێوەی چەند هێڵێکی وورد ، بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدات بۆ بۆ دیاریکردنی شوێنی نووسینەکان و دانانی شێوەکان لەسەر کارتەکە بە ووردی .

١٤.بە هەڵبژاردنی ئەم هەڵبژاردەیە کارتەکەمان تەواو لەگەڵ یەکتر گونجاو دەبێت .

١٥.دانانی باگراوند بۆ هەموو کارتەکە .

١٦.گەورەکردن و بچووکردنی کارتەکە لەکاتی دیزاین کردنی .

١٧.پرینت کردنی کارتەکە لەڕێ ی پرینتەرەکەوە .

١٨.پیشاندانی شێوەی کۆتایی کارتەکە کەلەسەر وەرەقەکە دەردەچێت .

١٩.شیکردنەوەی تەواوی بەرنامەکە بەزمانی ئینگلیزی .

٢٠.بەکلیك کردنی ئەم هەڵبژاردەیە وە دوایی کلیك لەسەر هەر هەڵبژاردەیەکی تر بکەیت ئەوا کاری هەڵبژاردەکەت بۆ ڕوون دەکاتەوە .

salim B. Abdullah
Designer

Mobile: 0750 490 1778
E-mail: salinberzinji@yahoo.com

تێبینی:
ئەگەر ویستمان کارتێکی تایبەت دروست بکەین بە خێرایی ئەوا دەتوانین قاڵبە ئامادەکراوەکان بەکاربهێنین ، ئەمیش بەکلیك کردنی لیستی file وە هەڵبژاردنی– New select from templates.

# بەرنامەی فـــــــلاش Mx

## زنجیرە( ١١ )

ئا: فەیسەل گەردی



وێنەی ١

<u>لیستەکان</u>

لیستەکان وەك هەر بەرنامەیەکی تر لە فلاشدا بریتین لەم ئامرازانەی کە ڕێبەر و هاوکاری بەکارهێنەری بەرنامەی فلاشن سەبارەت بە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە ، بەدرێژایی زنجیرەکانی رابردوو باسمان لە زۆربەی هەرە زۆری ئەو ئامراز و فەرمانانە کردووە لەگەڵ چۆنیەتی بەکارهێنانیان ،لەم زنجیرەیەدا هەوڵدەدەین کەوا فەرمانە گرنگەکان باس بکەین:

<u>لیستی فایل)File(وێنەی١)</u>

١)New From Template:دروستکردنی فایلی نوێ یا دروستکردنی فایلێکی لەو قالبانەی کە لە بەرنامەکەدا هەیە.

دروستکردنی قالبTemplate

لـــە لیستی فایـــل دەچینە سەر فەرمانیNew From Template کلیکی دەکەین و پەنجـــەرەی New Document مان بۆ دەکرێتەوە چەند قالبێکی تێدایە و هەر جۆرە قالبێکیش چەند جۆری هەیە لە لیستی ناوەڕاستدان لە لەلای ڕاستەشدا دەتوانین قالبەکە ببینین ، پاش هەڵبژاردنی قالبە کلیك لە سەر Create دەکەین دەبینین قالبەکە دێتە سەر شانۆی کار کردن ، وە دەتوانین بە ئارەزووی خۆمان دەستکاری بکەین بەو شێوازەی کەخۆمان دەمانەوێ. (وێنەی ٢).

٢) Open as Library : کردنەوەی فایلی فلاش بنچینەی پێکهاتەی فایلەکە لەبابەتەکان ،نەك بۆ نمایش کردنی .

کردنەوەی کارێك وەك کتێخانە

کردنەوەی کارێکی هەڵگیراوی فلاش بەهەموو پێکهاتەکانیەوە(هێماکانی وەك ڤیدیۆ کلیپ ،دوگمەکان ، وێنەکان) راستەخۆ لە کتێبخانەی فایلی کە تێدا کار دەکەین دەکرێتەوە بۆ سوود وەرگرتن لێی. کاتێ داوای پێکهاتەی Flaدەکەین فەرمانی Open as Library لە لیستی فایل دەکەین بە دوای فایلی فلاشی دەگەڕێین.(وێنەی٣)،پاش هەڵبژاردنی کتێبخانەکەمان بۆ دەردەکەوێت بە پێکهاتەکانیەوە . (وێنەی٤).



وێنەی ٢



وێنەی ٣



وێنەی ٤

٣) Save as Template: دروستکردنی قالبی تایبەت بەخۆمان و هەڵگرتن و کردنەوەی دواتر.

٤)Import to Library: هێنانی فایلی فلاش و دانانی یەکسەر لە کتێبخانەی فایلی داواکراو.

٥)Export movie & image :ناردنە دەرەوەی فایل بە شێوازی Swf،وێنە بە شێوازەکانی(PNG,GIF,JPG).
بۆ گۆڕینی کارەکەمان لە سەر شانۆی کارکردنە بۆ کارێکی تەواو بە شێوازی SWFیاگۆڕینی بۆ شێوازەکان وێنە .(وێنەی ٥).

٦) Publish Setting:دەستکاری کردنی چۆنیەتی دەرهێنانی دیمەن یا کارەکەمان کە پێی هەڵساوین یا بە سەر شێوەی فایلەکە بە شێوازی swfیا شێوازەکانی وێنە یا فلیم وە یاخود مۆسیقـــا .(وێنەی٦). بۆ نمونە گـــەر شێوازی Gif هەڵبژێرین ئەوا کلیـــك لە چوار گۆشەی تەنیشتی دەکەین و تایبەتمەندییەگان وێنەی Gif بەدەردەکەوێ دەتوانین هەمواریان بکەین وەك ئەوەی وێنەك جوڵاو بێت یا جێگیر وە ژمارەی دووبارە بوونەوەی جوولەکە دیاری بکەین لەگەڵ تایبەتمەنی رەنگەکان ..هتد . (وێنە٧).

هەروەها دەتوانی خۆت ئەوانی تر تاقی بکەیتەوە بۆ ئەوەی زیاتر ئاشنابیت لەگەڵ فەرمانەکانی .

File name:
Save as type: Flash Movie (*.swf)
Save
Cancel

یا

File name:
Save as type: JPEG Image (*.jpg)
Save
Cancel

وێنەی ٥

Publish Settings
Formats Flash HTML
Type: Filename:
Flash (.swf)
HTML (.html)
GIF Image (.gif)
JPEG Image (.jpg)
PNG Image (.png)
Windows Projector (.exe)
Macintosh Projector
QuickTime (.mov)
Use default names
OK Publish Cancel Help

وێنەی ٦

Publish Settings
Formats Flash HTML GIF
Dimensions: Width Height Match Movie
Playback: Static Animated Loop Continuously Repeat times
Options: Optimize Colors Interlace Smooth Dither Solids Remove Gradients
Transparent: Transparent
Dither: Diffusion
Palette Type:
Max Colors: 255
Palette:
OK Publish Cancel Help

وێنەی ٧

<u>لیستی هەموار کردن Edit</u>

فەرمانەکانی ئەم لیستە تایبەتن بە هەموار کردنی فایلەکان ، وە تارادەیەك زۆربەی فەرمانەکانی ئەم لیستە لە زۆربەی بەرنامەکان وەك یەکن ،بۆیە تەنها باس لەم فەرمانانەی خوارەوە دەکەین(وێنەی٨):

ئامادەکاری هێما Edit Symbol: بۆ هەموار کردنی هێما و تایبەتمەندیەکانی هەتا شێوەو چۆنیەتی دەرکەوتنی(مۆڤی کلیپ ، دوگمەکان ، شێوازەکانی وێنە)بەکار دێت.

ئامادەکاری دیاری کراوEdit Selected : ئەم هەموار کردنە تایبەتە بە شێوەی دیاری کراو بە هۆی ماوسەوە.

هەموار کردن لە هەمان شوێنEdit in place: هەموار کردنی شاشەیە جیا لە شانۆی کار کردن وە بەهۆی ئەم فەرمانە دەتوانین ئامادەکاری بابەتێ لە بکەین راستەوخۆ لە سەر شانۆی کار.

تایبەتمەندیەکانی فلاش Preferences : ئەم تایبەتمەنیانەیە کە لە وێنەی(٩) دا دیارە ، بە ئارەزووی خۆت دەتوانی هەڵیان بژێری و ئەکتیڤیان بکەیت .

<u>لیستی نمایش کردن)Viewوێنە١٠)</u>

Go to: ئەم فەرمانە کاتی ئەکتیڤ دەبێ کاتی دوو دیمەن یا زیاترمان هەبێ.

Outlines : نمایش کردنی بابەت و شێوەکانە بە هێڵەکانییانەوە لەگەڵ ئەو رەنگەی کە پێ پڕ کراوەتەوە .

Rulers:بۆ نمایش کردنی راستەیە لە سەر شانۆی کار کردن بۆ ووردەکار زیاترە.

Grid : کاتێ ئەم فەرمانە ئەکتیڤ دەکەین ئەوا راستەو خۆ لە پشت شانۆی کار کردن بە دەر دەکەوێت ئەمەش بۆ ووردەکاری زیاترە .

Snap To Pixels /object: ووردەکاری لە سەر بنچینەی پیکسلە و کاتی بە دەر دەکەوێ پاش گەورە کردن لە ٤٠٠ بێت ، چوار گۆشە بچوکەکان دەبینن ئەمەش هاوکارە بۆ وێنە وەك خۆی ..

Edit View Insert Modify Text Control
Undo Ctrl+Z
Redo Ctrl+Y
Cut Ctrl+X
Copy Ctrl+C
Paste Ctrl+V
Paste in Place Ctrl+Shift+V
Paste Special...
Clear Backspace
Duplicate Ctrl+D
Select All Ctrl+A
Deselect All Ctrl+Shift+A
Cut Frames Ctrl+Alt+X
Copy Frames Ctrl+Alt+C
Paste Frames Ctrl+Alt+V
Clear Frames Alt+Backspace
Select All Frames Ctrl+Alt+A
Edit Symbols Ctrl+E
Edit Selected
Edit in Place
Edit All
Preferences...
Keyboard Shortcuts...
Font Mapping...

وێنەی ٨

Preferences
General | Editing | Clipboard | Warnings | ActionScript Editor
General
Undo Levels: 100
Printing Options: Disable PostScript
Selection Options: Shift Select
Show Tooltips
Panel Options: Disable Panel Docking
Timeline Options: Disable Timeline Docking
Span Based Selection
Named Anchor on Scene
Highlight Color: Use this color
Use layer color
Font Mapping Default: _sans
OK Cancel Help

وێنەی ٩

View Insert Modify Text Control Wi
Go to — First Home; Previous Page Up; Next Page Down; Last End; Scene 1; Scene 2; Scene 3
Zoom In Ctrl+=
Zoom Out Ctrl+-
Magnification
Outlines Ctrl+Alt+Shift+O
Fast Ctrl+Alt+Shift+F
Antialias Ctrl+Alt+Shift+A
Antialias Text Ctrl+Alt+Shift+T
Timeline Ctrl+Alt+T
Work Area Ctrl+Shift+W
Rulers Ctrl+Alt+Shift+R
Grid
Guides
Snap to Pixels
Snap to Objects Ctrl+Shift+/
Show Shape Hints Ctrl+Alt+H
Hide Edges Ctrl+H
Hide Panels Tab

وێنەی ١٠

# شـاردنەوەی زانیاریە گرنگەکان لەنێو Recycle bin

ئا/ باوکی ماری
Kameran7605@yahoo.com

زۆر لەبەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر حەزدەکەن زانیاری یەکانیان خەزن بکەن دوور لەدەستی منداڵەکانیان، یاخود کەسانی دەست تێوەردەر، ئەمەش ڕێگەیەکی ئاسان و خێرا بۆ شاردنەوەی زانیاری‌یەکان لەدەست کەسانی تر، کە ئەوەستێ لەسەر شێوەی سیستەمی ویندۆز لە مامەڵەکردنی لەگەڵ مەلەفەکان .

یەکەم جار هەڵدەسین بە دروست کردنی فۆڵدەرێك ، بۆ نمونە بە نێوی govar ، کە بریتی یە لەو فۆڵدەرەی کە زانیاری یە گرنگەکان دەگرێتە خۆ، وە پاشان ناوەکەی دەگۆڕین بۆ Govar.{645ff040-5081-101b-9f08-00aa002f954e}




وێنە ١

وە دەتوانین هەر پاشگرێکی تر دیاری بکەین وەکو ئەمانەی کۆتایی بابەتەکە، دەبینین شێوەی دەلیلەکە دەگۆڕێت بۆ شێوەی recycle bin ، ئەگەر ئێمە کلیکی لەسەر بکەین واتە بیکەینەوە دەبینین وەکو شێوەی recycle bin دەکرێتەوە ، وە مەلەفەکانی نێوی شاراوە دەبن واتە دوور دەبن لەدەستکاری کردن ( وێنەی ژمارە ٢)



وێنە ٢

بۆ دووباره پیشاندانی مەلەفەکانی نێوی دەبێ مەلەفێکی batch دروست بکەین کە پێك دێت لەیەك دێر . هەڵدەسین بە کردنەوەی بەرنامەی notepad ، وە ئەم دێرەی تیا دەنووسین

Rename govar.{ 645ff040-5081-101b-9f08-00aa002f954e}govar

ووشەی govar ناوی ئەو فۆڵدەرەیە کەبەکاری دەهێنین ، وەبۆ خەزن کردنی مەلەفەکە دەچین بۆ file پاشان save as وە ناوێکی لێ دەنێین بۆ نمونە openit.bat ، وە کلیکی save دەکەین ( وێنەی ژمارە ٣)




وێنە ٣

ئەگەر ئێمە کلیکی ئەم فایلە بکەین دەبینین دەلیلەکەمان دەگەڕێتەوە سەر شێوەی ئەسڵی خۆی، بەخۆی و فایلەکانی نێوی، وەهەروەها دەتوانین مەلەفێکی تریش دروست بکەین بۆ گەڕاندنەوەی فۆڵدەرەکە بۆ شێوەی recycle bin ، وەکو شێوەی یەکەم جار ئەمیش بە نووسینی ئەم دێرە

Renamegovar govar.{ 645ff040-5081-101b-9f08-00aa002f954e}

وە دەتوانین ئەم مەلەفەش ناوێکی لێ بنێین ، بۆ نمونە closeit.bat ، وە خەزنی بکەین وە بەکلیك کردنی ئەم فایلەش دەبێتە هۆی داخستنی فۆڵدەرەکە وە گەڕاندنەوەی بۆ شێوەی یەکەم جار . پێویستە ئەم دوو مەلەفە openit.bat و closeit.bat خەزن بکەین لەسەر دیسکێکی دەرەکی وە دای بنێین لە شوێنێکی پارێزراو ، وە لایان بەرین لەسەر سیستەمەکە .

- ئەم ڕێگایە لە سیستەمی ویندۆز دەبێتە هۆی شاردنەوەی مەلەفەکان وە بەهیچ شێوەیەك دیارنابن، هەتا ئەگەر فەرمانی searchیش بەکاربهێنین بۆ گەڕان بەدوای مەلەفی دیاری کراو .
- بەکارهێنەر دەتوانێت پاشگری تر بەکاربهێنێت بۆ کۆمەڵێك بەرنامەی تر، ئەمەش پاشگرەکان .



Shortcut.{00021401-0000-0000-c000-000000000046}
State menu taskbar and.{0df44eaa-ff21-4412-828e-260a8728e7f1}
Search folder.{1f4de370-d627-11d1-ba4f-00a0c91eedba}
My network places.{208d2c60-2aea-1069-a2d7-08002b30309d}
My computer.{20d04fe0-2aea-1069-a2dd-08002b30309d}
Control panel.{20d04fe0-3aea-1069-a2dd-08002b30309d}
Printers and faxes.{2227a280-3aea-1069-a2de-08002b30309d}
Internet explorer.{2559a1f4-21d7-11d4-bdaf-00c04f60b9f0}
Outlook.{2559a1f5-21d7-11d4-bdaf-00c04f60b9f0}
My document.{450d8fba-ad25-11d0-98a8-0800361b1130}
Recycle bin.{ 645ff040-5081-101b-9f08-00aa002f954e}
Folder option.{6dfd7c5c-2451-11d3-a299-00c04f8ef6af}
Network connection.{7007acc7-3202-11d1-11d2-00805fc1270e}
Brief case.{85bbd920-42a0-1069-a2e4-08002b30309d}
Add network place.{d4480a50-ba28-11d1-8e75-00c04fa31a86}
Scheduled tasks.{d6277990-4c6a-11cf-8d87-00aa0060f5bf}
Scanner&cameras.{e211b736-43fd-11d11-9efb-0000f8757fcd}

## ئاگاداری

داوا لە هەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانە دەکەین کە هەر پێشنیارێك یان هەر تـێـبـیـنـیـێـك یـان هـەر رەخنەییێکیان هەبوو یان هەر کەم وکورییێکیان لە گۆڤارەکە بە دی کرد با ئاگادارمـان بـکـاتـەوە بـەم ناونیشانە :

هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر شەقامی شەست مەتری نزیك هۆڵی زەرد.
ژمارە تەلەفۆنی : ( ٢٢٢٢٧٢١ ) / مۆبایل: ( ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ )
یان پۆستی ئەلکترۆنی:

E-MAIL: COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM
E-MAIL: ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM
E-MAIL: ARAS_AAA@HOTMAIL.COM





# بێل گێتس کەسایەتیەکی سەرکەوتووە شایەنە بکرێتە پێشەنگ

ئا: ساگار ئەحمەددین رەحمان
سەرچاوە / گۆڤاری ( عالم الكومبيوتر والانترنيت )

ڕۆژنامەی (اخبار الیوم) ی میسری گفتوگۆیەکی سەرنج ڕاکێشی بلاوکردەوە کە لە گەڵ (بیل گیتس) سەرۆکی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت :پاش سەردانەکەی بۆ شاری قاهیرە٠ بیل گیتس کەیەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی جیهان کە سامانەکەی بە(٨٥) ملیار دۆلار هەژمار دەکرێ ٠ بیل لە سەرەتای وتەکانیدا جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە مرۆڤێکی زۆر سادەیە وە حەزیش ناکات خەڵکی جگەلە( بیل ) بە ناوێکی ترەوە بانگی بکەن ، لە بەر ئەوەی هەموو ئەوانەی لە کۆمپانیای مایکرۆسۆفتن هەر بەم ناوەی یەکەم بانگدەکرێن



،کەوا خۆی دادەنێ بەکەسێکی سادەی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت ٠ بیل لە سەرەتای ژیانییەوە بە هۆی چاوڕوونی و زیرەکی خۆی توانی داهاتووی خۆی بە کۆمپیتەرەوە ببەستێ، تاکو گەیشتە ئەو شوێنەی کە وازی لە خوێندنی زانکۆ هێنا لە گەڵ هاورێکەی (بوول الین) ،ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٥٧ بناغەی کۆمپانیای مایکرۆسۆفتی دامەزراند٠ لە وەلآمی پرسیارێکدا ئایا بیل پەشیمان نە بۆتەوە لە وازهێنانی لە خوێندنی زانکۆ ؟ لە وەلآمدا وتی: نەخێر ، چونکە تەماشای شتێکی گرنگم دەکرد کە ئەویش کۆمپیوتەر بوو ،تا بتوانم ڕۆڵی خۆم ببینم لە گەشەسەندن و بنیاتنانی ٠ ئەگەر کورەکەت وازی لە خوێندن هێنا وەکو تۆ کە ئەنجامتدا ؟ بۆ ماوەیەك بێ دەنگ بوو ، وتی : وازم هێنا لە زانکۆ بە تەئکید دەمزانی چی دەکەم ، وە ئەگەر کورەکەم بیەوێ ڕازیم بکا بە وازهێنانی لە زانکۆ بە مەبەستی بەدیهێنای ئامانجەکانی ، ئا لێرەدا تاکە مەرجم ئەوەیە کە ئەمە ببەسترێتەوە بەکاتێکی دیاریکراو ،پاشان گەڕانەوەی بۆ تەواو کردنی خوێندنی زانکۆ٠ گرنگترین ئەو شتانەی کە بیل لە قسەکانیدا باسی لێوە کرد ،ئەوە بوو کە شەیداو تێنووی کارکردن بوو لە بواری بەرنامە ڕێژیدا ، کە هەستی بەچێژو خۆشییەکی زۆر دەکرد ، ئەمەش نەکو لەبەر لایەنی مادەی ، بەڵکو ئەو بیری دەکردەوە وەکو بەرنامەڕێژێك ، بیل ئەو دەرفەتەی نییە کە بیر لەوە بکاتەوە ببێ بە یەکێ لە دەوڵەمەندە ناودارەکانی جیهان ٠ ئەگەر کارکردن وەکو بەرنامەڕێژێك بخەنە دەستێکی وە هەموو سامانەکەی بخەنە دەستەکەی ترەوە ، ئەوا کارکردنەکەی هەڵدەبژێرێ ،ئەو دادەنیشێ لە بەرامبەر کۆمپیوتەر بۆ داهێنانی بەرنامەی نوێ ، بیل جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە کار ئەکات بۆ ئەوەی سامانێکی زۆر بۆ میراتگرەکانی بە جێ نەهێلێ ، چونکە ئەوە

لە بەرژەوەندی ئەواندا نییە • دەربارەی ماوەی کارکردنی ڕۆژانەی ( بیل) وتی: ڕۆژانی خەوتنم لە سەر ئامێری کۆمپیوتەرە پاشان جارێکی تر هەڵدەستمەوە بۆ تەواوکردنی کارەکان •ڕۆژانی ئاسایی (١٢)کاتژمێر کار دەکات ،بەلاّم ڕۆژانی پشودان (٨) کاتژمێر کار دەکات کەبەکاتێکی کەمی دادەنێت ، بیل کارکردنی خۆش دەوێ و پیرۆزی دەکات بە گرنگترین کاری دادەنێت لە سەر زەوی ، بیل هەموو دەم سوورە لە سەر خوێندن و گەران و گەشت و چاوپێکەوتن لە گەڵ خەڵکان بەمەبەستی پەیداکردنی شارەزایی لە بیر بۆچوونیان ،وە بینینی داهێنراوی نوێ کە ئەمانە هەموو دەبنە هۆی دەوڵەمەند کردنی لایەنی زانیاری •خوێنەری خۆشەویست گەر سەرنجی وتەکانی (بیل) بدەین دەتوانین پوختی بکەینەوە لە چەند خاڵێکی گرنگ:-

-بیل مرۆڤێکی سادەو بێ فیزە ، هەر کەسێ کاری لە گەڵدا کردبێت و دواندبێتی ئەمەی سەلماندووە•

-بەپیرۆز کردنی کار بەپلەی یەکەم ،وە دڵسۆزی لە کارکردندا •

-بیرو خەیاڵی بیل لە ژیانیدا وەکو بەرنامەرێژێك ،چونکە ئەو کاتەی نییە کە بیربکاتەوە ببێتە یەکێ لە دەوڵەمەندەکانی جیهان •

-دەست نیشانکردنی ئامانجەکانی پێش هەر قۆناغێك ،وەبریاردانێکی بوێرانە لە پێناو جێ بە جێ کردنی ئامانجەکان ،ئەگەر ئەمە لە سەر ئەستۆی شتی تریش بێت نموونەش(خوێندنی زانکۆ)•

-بیل لەگەڵ هەبوونی هەموو ئەو زانیارییەی کە هەیەتی بەلاّم سوورە لە سەر خوێندن بەمەبەستی زیادکردنی زانیاری و داهێنانی چاکتر لە کارەکەی •

-بیل دەڵێ :من سامانێکی زۆر بە جێ ناهێڵم بۆ میراتگرەکان چونکە لە بەرژەوەندی ئەواندا نییە ،ئەمەش تاکو نرخ و بەهاو کۆششکردن ون نەکەن لە ژیانیاندا•

لە کۆتاییدا دەڵێم(بیل) هەموو ئەو دەسکەوتانەی کە بە دەستی هێنا پاش هەوڵو کۆشش و شەونخونییەکی زۆر ،ئێستاش کەیەکێکە لە دەوڵەمەندە ناودارەکانی جیهان زۆر بێ فیزە دروشمی ژیانی کارکردنە !!!

دوای گوێبیست بوونی ئەم سەرگزەشتە سەرکەوتووەی (بیل) ئایا شایەنی ئەوە نییە بکرێتە رابەر بۆ لاوەکانی ئەم سەردەمە •



# ٣٨ ڕێنمایی بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەر

زنجیرەی هەشتەم

ئا: شاخەوان عمر حسن
shakhawano@yahoo.com

٢٦ - پاوەر سەپلای (power supply)

یەکەی سەرەکی دابینکەری کارەبا بۆ بەشەکانی کۆمپیوتەر power supply یەکێکی تری هۆکارەکانی سستی و هێواشبونی کارەکان و ڕاپەراندنی فەرمانەکانی کۆمپیوتەرە لەراستیدا power supply تەنها فەرمانی پێدانی وزەی تەواوە بە کۆمپیوتەر لەڕێگای ئەو هێلانەی لێیەوە ڕاکێشراون بەلأم لەئەنجامی تێپەرینی کات و بەکارهێنان و پێکرددنی کۆمپیوتەر بە بەردەوامی دەبێتە هۆی لێچونی بەشێك لە مادە کیمیاویەکانی ناوی بەمەش وزەی پێویست ناگەینێت بۆ یەکەکانی کۆمپیوتەر بۆیە دەبینین بەشێك یان هەندێك لەبەشەکانی کۆمپیوتەر یان بەسستی کاردەکەن یان لەکاردەکەون و ڕاستەوخۆ کاریگەری دەبێت لە سەر ئەدای کۆمپیوتەر چونکە دەبێتە هۆی نەگەیشتنی وزەی پێویست بۆ ناو بەشەکە . بۆ زانیاریتان تەمەنی power supply درێژترینیان بریتیە لە ٢ ساڵ .وە ئەم تەمەنە دەگۆرێت بەپێی کاتی کارکردن

٢٧ - مۆدێم

ئێمە لە برگەکانی پێشو باسمان کرد کە سستی لەهەر بەشێك هەبێت واتە کۆمپیوتەرەکان بەشێوەیەکی ئاسایی کارناکەن وە بۆ چارەسەری ئەم کێشەیەش چەندان ڕیٚ و شوێنی جۆارو جۆرمان گرتۆتە بەر بۆ ئەوەی بتوانین ئەدای کۆمپیوتەر بگەینینە ئاستی ئاسایی خۆی . لەم ڕوانگەیەدا بونی کێشە لە مۆدێم واتە بونی کێشە لە پەیوەندیکردن بە ئەنتەرنێت واتە ناتەواوی لە کارکردنی کۆمپیوتەر . بۆیە دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کە هەرکێشەیەك لە مۆدێم هەبوو واتە ئەم مۆدێمە ناتوانێت بەتەواوی ئەرکەکانی خۆی هەڵبستێت بەمەش بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە ئەبێت ئاگاداری تەواوی پارچەکانی کۆمپیوتەر بین بۆ ئەوەی بتوانین کۆمپیوتەر بەشێوەیەکی تەواو لەتوانای خۆی کاربکات نەوەك خاوبێت یان کارنەکات یان ئەوەندە بەهێواشی فەرمانەکان ڕاپەڕێنیت کەوا بێزار بین .

٢٨ - پانکەی پرۆسێسەر

یەکەی چارەسەری گشتی پرۆسێسەر وە یەکێکە لە بەشە سەرەکیەکانی کۆمپیوتەر لەبەر ئەوەی خێرایی کارکردنی زۆرە بۆیە پێویستی بە سارد کردنەوە هەیە بۆ ئەم مەبەستەش باشترین ساردکەرەوە کە بتوانرێت بۆ کۆمپیوتەر دابنرێت بریتیە لە پانکە ، ئەم پانکەیە بچوکە بەلأم دەتوانێت پرۆسێسەر سارد بکاتەوە بەلأم ڕاوەستانی یان خاوبونەوەی یان هەر کێشەیەك یان سستیەك لە کارکردنیدا دەبێتە هۆی کەمبونەوەی ئەدای پرۆسێسەر واتا کەمبونەوەی ئەدای کۆمپیوتەر بەگشتی جا بۆ چارەسەر یەکێك لە ڕێگا ئاسانەکان بریتیە لە دانەنانی کۆمپیوتەر لەشوێنێك کە تۆزی لێبێت یان دانەگیرساندنی کۆمپیوتەر بە بیٚ داخستنی کەیسی کۆمپیوتەر چونکە هەندیٚ بە بیانوی ئەوەی کە پرۆسێسەر سارد بێتەوە پارچەکانی تەنیشتی پرۆسێسەر دەکەنەوە بەمەش پانکەی پرۆسێسەر لەوانەیە داوو شتنی سوك دەزوو ڕابکێشێت و ئەدای کەم دەبێتەوە یان زیان بە پرۆسێسەر دەکەوێت

٢٩ - مەزەبۆرد

پاك کردنەوەی مەزەبۆرد لە تۆزو پیسایەی کە لەسەری نیشتووە یەکێکە لەکارە تایبەتەکان چونکە ئەم تۆزە دەبێتە هۆی گڵدانەوە گەرمی لەسەر مەزەبۆردو بەشەکانی تر بەشێوەیەکی گشتی واباشە تەواوی ئەم کارانە هەموو دوساڵ جارێك ئەنجام بدرێت تاکو کۆمپیوتەر لەروی هاردەوە هیچ کێشەیەکی نەبێت .

٣٠ - پاك كردنەوەو سرینەوەی فایلە زیادەكانی ناو Recent

وەكو باسمان هەموو فایلێكی زیادە دەبێتە هۆی بارگرانی بۆ سەر سیستەم جا لەناو كۆمپیوتەر جگە لە (History، TEMP، Temporary Internet Files) فۆڵدەرێكی تر هەیە بەناوی Recent كە فایلی زیادەی تێدا كۆدەبنەوە بۆ سرینەوە ئەم فایلانە دەچین ئەم زاراوەیە لە فەرمانی (Run) دەنوسین پاشان (OK) دەكەین فۆڵدەرێك دەكرێتەوە دێین هەموو فایلەكانی ناوی دەسرینەوە بەمەش برێك لەقەبارەیەكی دیاریكراو دەیگەرێتەوە بۆ كۆمپیوتەر .








# چۆن فەرمانی خەزن کردن لە وۆرد دەگۆڕین

ئا: ئاوارە محمد

مەبەست لەم کردارە بریتیە لەگۆڕینی فۆرماتی خەزنی فایلەکانی وۆرد لە شێوەی ( Word Document) بۆ شێوەیەکی تر بە ئارەزوی خۆمان واتە ئێمە لەکۆی ٢٠ فۆرماتی خەزن کامە زۆر بەکار دەهێنین ئەو ئەو فۆرماتە دادەنێین وە هەرکاتێك بە هەرشێوەیەك فایلێك خەزن بکەین یەکسەر بەبێ دەستنیشان کردن بچێتە سەر ئەم فۆرماتە بۆ نمونە هەموو کاتێك فایلێکی وۆرد خەزن بکە یەکسەر بە فەرمانی ( Word Document) خەزن دەبێت بەلآم بۆ ئەوەی ئێمە ئەم فەرمانە بگۆڕین بۆ نموونە بیکەینە ( word 97 -2002 &6.0 /95 RTF (*.doc) کە بەردەوام کارمان پێیدەبێت پێویستە ئەم هەنگاوانەی خوارەوە پەیرەو بکەین : لە سەرتادا بەرنامەی وۆرد دەکەینەوە پاشان کلیك کردن لەسەر (Tools) دەکەین پاشان کلیك لەسەر (Options)دەکەین بروانە وێنەی (١)

پاشان بۆکسێك دەکرێتەوە کلیك لەسەر (save) دەکەین بروانە وێنەی (٢)

ئینجا لە بەشی خوارەوەی ئەم بۆکسەدا نوسراوە (save word files as) لەم بۆکسەدا بە ئارەزوی خۆمان فۆرماتێك دەست نیشان دەکەین و دوایی کلیك لەسەر (OK) دەکەین بروانە وێنەی (٣ )

بەمەش هەرکاتێك هەر فایلێکی وۆرد خەزن بکەیت بە فۆرماتی (word 97 -2002 &6.0 /95 RTF (*.doc)) خەزن دەبێت وە یەکێك لە سودەکانی ئەم کارە بریتە لە ئاسانی بونەوەی ئەم فایلانە لەسەر هەموو ئۆفیسێك بەبێ کێشە .


وێنە ١


وێنە ٢


وێنە ٣



# چارەسەرکردنی ڤایرۆسی (pictures)

ئا: هاوکار کۆیی



وێنەی (١)

ئازیـزان لە ماوەکانـــی ئـــەم دوایـــەدا هـاتنی ڤایرۆســی (pictures) بۆ سەر ماڵپەڕەکانی ئەنتەرنێت بە تایبەتی ئەو ماڵپەرانەی کە وێنەی تێدایە وە ئەو ماڵپەرانەی کە چاتی تێدا ئەنجام دەدرێت بۆیە زۆربەی کۆمپیوتەرەکانی تووشی ئەم ڤایرۆسانە بووە ، لەراستیدا ئەم ڤایرۆسە ڤایرۆسێکی لاسایی کەرەوەیە ماوەی هەڵهاتنی ٦ تا ١٢ رۆژ دەبێت و دەچێتە ناو هەموو فایلەکان وە هیچ ڤایرۆسێك ناتوانرێت لای ببات پاش هەموو تاقی کردنەوەیە ئەنتی ڤایرۆسی ( syamantec ) توانی ئەم ڤایرۆسە لا ببات و لەناوی ببات ئەم ئەنتی ڤایرۆسە لەپاش دابەزاندنی دەبێ پەیوەندی بەئەنتەرنێتەوە بکرێت وە بەنوێکردنەوەی ئینجا ڤایرۆسەکە لەناو دەبات .



وێنەی ( ٢ )

دانانی ئەنتی ڤایرۆسەکە بەم رێگەیەوە دەبێت سەرەتا بەکرنەوەی ئەنتی ڤایرۆسەکە هێمای دووەم هەڵدەبژێرین بروانە وێنە ٢.



وێنەی ( ٣ )

پاشان هێمای یەکەم هەڵدەبژێرین وە ئەم هێمایە بۆ هەموو ویندۆزەکان بەکاردێت بروانە وێنە ٣

پاشان کلیکی نێکست بکە بڕوانە وێنە ٤.



وێنەی ( ٤ )

هەڵبژاردنی بازەنەی سەرەوە و نێکست کردن بڕوانە وێنە ٥.



وێنەی ( ٥ )

ئەگەر یەك کۆمپیوتەر بوو ئەوا بازەنەی سەرەوە ئەگەر کۆمپیوتەرەکە سێرڤەر بوو بازنەی خوارەوە ئینجا هەڵبژێرە ونێکست بکە بڕوانە وێنە٦ .



وێنەی ( ٦ )



ئەگەر ویندۆزەکە هۆم بێت یان ئیتنەری بێت ئـەوا بازنـەی سـەرەوە هەڵبـژێرە ئەگـەر ویندۆزەکـە پرۆفیـشنەڵ بـێ ئـەوا بازنـەی خوارەوە دیاری دەکەین بڕوانە وێنە٧ .



وێنەی ( ٧ )

دیاری کردنی هەردوو خانەکە بۆ پەیوەندی کـردن بـە سـایدی ئەنتەرنێتەکـەوە بڕوانـە وێنە٨.



وێنەی ( ٨ )

لـەپاش دابەرانـدنی ڕاستەوە خـۆ کـە داوای نوێ بوونەوە دەکات پاش نوێ کردنەوە ئەوا دەست دەکات بە گەڕان لەناو کۆمپیوتەرەکە ڤایرۆسـەکە لـەناو دەبـات بـەم جـۆرە لـەم ڤایرۆسە ڕزگارمان دەبێت بڕوانە وێنە٩.



وێنەی ( ٩ )

# رێگایەکی جیاواز بۆ ون کردن و شاردنەوەی فایلەکان و فۆڵدەرەکان

وەرگێرانی: لمیاء عابد
سەرچاوە: www.iranbestlink.com

لەوانەیە بۆ هەمومان رووی دابێت کە ویستبێتمان فایلێك بشارینەوە وە لە پێش چاو نەبێت ، زۆربەی ئێمە فایلەکان دەگەڕێنینەوە سەر شێوەی شـــاراوە (Hidden) بەلام زۆر بە ئاسانی ئەتوانرێت ئەو فایلانە لە شێوەی (Hidden) در بهێنرێت . هەندێك لە بەرنامەکان بەشی Folder option لە شریتی کەرستەکان ون ئەکات ،بەلام زۆربەی ئەم بەرنامانە زیان بە پێکهاتەی ئەگەیێنن .بەرنامەی تر هەن کە وەکو Folder lock ن وە فایلەکە ئەگوازنەوە بۆ فولدەرێکی تر وە بە بینینیان جارێکی تر ئەبێت وشەی نهێنی ( Pass word) بنوسین بەلام ئەگەر بە هەر شێوەیێك ویندۆزی ئێوە دوچاری گرفت بوو وەناچار بوون کە ویندۆزی تازە دانێنەوە ،فایلەکانی ئێوە سەداسەد هەمو لەدەست ئەڕۆن و ئەسڕێنەوە .لەم رێگایەی ئێستە کە لەوانەیە یەکێك بێت لە امکانیاتی ویندوز XP ئێوە بەهیچ شێوەیێك فولدەرە شاراوەکانی خۆتان وفایلەکانی ناویان لە دەست نادەن وە بە دانانی ویندۆزی تازە هەمو فایلەکان دەگەڕێنەوە سەر شێوەی یەکەمیان .



وێنەی ١

سەرەتا فولدەرێك دروست بکەو ناویەکی بۆ دابنێ وێنەی ( ١) لەسەر فولدەرەکە کلیکی لای راســت بکــەو ئــەمری Propertiesهەلبــژێرە .وەکــۆ وێنـــەی ( ٣) بەشـــی "Customize" هەلبژێرەو لەسەر Change Icon کلیـك بکە تا وێنەی ژمـــارە ( ٤ )ت بو دەرئەکەوێت .



وێنەی ٢


وێنەی ٣


وێنەی ٤



دوای ئەوە لە بەینی ئایکۆنەکان بەدوای شوێنێکی بەتاڵ بگەڕێ و کلیك بکە (وێنەی ٥ ) دوای ئەوەی کە شوێنێکت دیاری کرد OK داگرە ئەگەر پەنجەرەیێك هاتە پێشت ئەوا Yes داگرە. ئەگەر تا ئێستای ئیشەکەت بە باشی روشتبیت ئەوا فوڵدەرەکەت وەك وێنەی ٦ بەدەرئەکەوێت. ئەم بەشەی کارەکەت گرینگترین بەشیەتی : وەکو وێنەی ٧ ناوی فوڵدەر یان فایلە کەت بگۆڕە ....ئاگادار بە لەم کاتەدا Num lock داگرسابێت ئێستا کلیلی Alt لای چەپی کیبوردەکەت داگرە ولە بەشی Num lock ژمارەکانی ٠١٦٠ داگرە ئاگادار بە لە کاتی نوسینی ئەم ژمارانە ئەبێت Alt ت داگرتبێت . ئەگەر ئەو ئیشانەی کە من پێم وتی بە وردی ئەنجامت دابێت ئەوا فوڵدەرەکەت وەکو وێنەی ژمارە (٨ ) ی لێ هاتووە . ئاگادار بە شوێنی فوڵدەرەکەت هیچ شتێکی لێ بەجێ نامێنێت وە هەرکاتێك ویستت فوڵدەرەکەت بکەیتەوە لە شوێنەکەی کلیکی لای راست بکە وە Open هەلبژێرە . ... خاڵێکمان هەیە کەپێویستە ڕەچاوی بکەیت ئەویش ئەوەیە کە هەوڵ بدەیت ناوی ئەو فوڵدەرەی کە دروستت کردووە لە پیتە کۆتاییەکانی زمانی ئەنگلیزی هەلیبژێریت وەکو X یانZ . سەرکەوتوین .



وێنەی ٥



وێنەی ٦



وێنەی ٧



وێنەی ٨







# ئەنتەرنێتی وایەر لێس

ئا / ڕێناز ئەردەڵان بکر

**سەبارەت بە چۆنیەتی کارکردنی سیستەمەی ئەنتەرنێتی وایەر لێس و ڕێژە و ژمارەی بەشداربوان و نرخی بەشدار بـوون ڕووی پرسیارمان ئاراستەی کۆمپانیایی ( تارین نێت ) و کۆمپانیایی ( کۆرەك تیلکۆم ) کـرد کـە بـەم جـۆرە وەڵامیـان داینەوە .**



**سەرەتا لە وەڵامی پرسیارێك کە ئاراستەی کۆمپانیایی تـارین نێـت مان کـرد سـەبارەت بـە چۆنیەتی بەشـداری کردنـی ئەنتەرنێتـی وایەرلێس ؟ بەرێز ( ابراهیم محمـد عزیـز ) بریکـاری کۆمپانیایـی تارین نێت گووتی :**

کاتێك هاووڵاتی دێت ئێمە ئامێرێکمان هەیە ئەو ئامێرانە بە پێ ی جۆرەکەی لە (١٥٠ $ ) هەمانە تا ( ١٥٥ $ ) و ( ١٦٠ $ ) دۆلاریشمان هەیە بۆ بەشداری کردن لەگەڵ هێڵەکەی ئێمەدا دەبێت بەشداربووەکە ئامێرەکە بکڕێت وئامێرەکەش بریتیە لە ( ئەنتینێك ) کە دەبێت لە سەربان دایبنێت کە ئەو ئەنتێنەش نەبەستراوە بە خەتی تەلەفۆن بەڵکوو بە هۆی وایەرێکەوە لە کۆمپیوتەر دەبەستیرێت و بۆیەش پێی دەڵێین وایەر لێس چوونکە پەیوەندی نیە بە تەلەفۆنەوە و دواتریش دەبێت پێناسەی تایبەتی بۆ بکرێت و بەم شێوەیە بەشدار بوو دەتوانێت ئەنتەرنێت بەکار بێنێت و کاری لەسەر بکات .

**لە وەڵامی پرسیاری جیاوازی نێوان ئەنتەرنێتی وایەر لیس و ئەنتەرنێتی تەلەفۆنی نۆرماڵ ؟ بەرێزیان ووتی :**

ئەنتەرنێتی وایەر لێس هێڵێکی خێراترە قەبارەی ئەو فایلانەی وەری دەگری گەورەترە هەروەها قەبارەی ئەو فایلانەی دەتوانی بینێری زیاترە جگە لەوەش کێشەی ئەوەشی نی یە بەهۆی زۆربوونی ژمارەی بەشداربوان هێڵەکە هێواش ببێتەوە لە ئەنتەرنێتی نۆرماڵ کاتێك تەلەفۆنی نۆرماڵ خراپ بێت ئەوا هێڵی ئەنتەرنێتەکەش تێك دەچێت بەڵام ئەم کێشەیە لە ئەنتەرنێتی وایەر لێسدا نیە .

**سەبارەت بەزانینی خێرایی هێڵی ئەنتەرنێتی وایەرلێس تارین نێت و خێرایی ( داونلۆد ) و ( ئاپلۆد ) بەرێزیان دەڵێت :**

خێراییەکەی بەگوێرەی جۆری بەشداری کردنە بۆ نمونە ئەو هێڵانەی ئێمە لە بازار دەیان فرۆشین لە ( داونلۆد و ئاپلۆد ) ( ٦٤ ) kb ە لە چرکەیەکدا وەك ستاندەرێك بۆ خەڵکی لە ڕووی پارە و بەشداربوونەوە سەیریان کردووە کەوا گونجاوە وەکو خێرایەکەی زۆر گونجاو و باشە سەبارەت بە دام و دەزگاکانی حکومەت وە هەندێك کۆمپانیا کە لە کەرتی تایبەت کار دەکەن پێویستیان بە توێژینەوە هەیە یاخود فایلی گەورە دەنێرێن یاخود ئەکادیمین ئەو جۆرانە ئێمە دەتوانین خێرایەکەی لە جیاتی ( ٦٤ ) بکەینە ( ١٢٨ یاخود ٥٠٠ ) بدەین بە پێ ی ئەو بەشداریەی داوای زیادی دەکەن ئێمە زیادی دەکەین لەو کاتەش دا ئەو ئامێرەی دەیفرۆشین ئامێرێکی ترە پێ دەڵێن ( فلات پەنەر ) ئەو جۆرە بەهای تایبەتی خۆی هەیە دەتوانێت لە ( ١٢ ) تاوەکو ( ١٠٠ ) کۆمپیوتەر لێ ببەسترێت .

**لە وەلامی پرسیاری نرخی بەشداربووان و کێشە و گرفتەکان بەرێزیان گوتی :**

نرخەکان جۆری زۆریان هەیە بۆ نموونە بە کارت هەیە وەك چۆن کارتی مۆبایل بەکار دەهێنرێت هەروەها مانگانەشمان هەیە کە شەو و ڕۆژ و بەشداربوو دەتوانێ کاری پێ بکات کە نرخەکە بە ( ٣٥ $ ) کارتێکی ترمان هەیە ماوەکەی ( ١٠٠ ) کاتژمێرە نرخەکەی بە ( ٢٥ $ ) دەتوانی لە ماوەی ( ٤٥ ) ڕۆژ سەرفی بکەی واتا ئەگەر لەم ماوەیە بە کاری نەهێنی مافی بە کارهێنانی دەسوتێت کارتێکی ترمان هەیە نرخەکەی ( ١٠ $ ) ماوەکەی ( ٣٠ ) کاتژمیرە یەکێکی تریشمان هەیە نرخەکەی ( ٢٠ $ ) بۆ ماوەی ( ١٥ ) ڕۆژە زیاتر بۆ ئەو کەسانەیە کە سەفەر دەکەن یان بۆ ماوەی کاتی دێنە وولات . هەموو کارێك لە دەستپێك گرفتی خۆی هەیە بۆ نمونە ئەوانەی دەیانەوێ بەشداری بکەن شارەزایی تەواویان نیە وە ئەگەر گرفتەکە لە لایەن ئێمەوە بێت ئەوە هەوڵ دەدەین چارەسەری بکەین و کار ئاسانی بکەین .

**سەبارەت بە ئامانجی دامەزراندنی ئەم جۆرە سیستەمەی ئەنتەرنێتە بەرێزیان دەلێت :**

بە بۆچونی من دامەزراندنەکە هەر بۆ لایەنی ئابووری نیە یاخود بۆ پارە کۆکردنەوە چونکە خزمەتێکی گرنگە هەموو گەلانی جیهان و هەموو کۆمەڵگایەك و هەموو تاکێکی ئەم جیهانە ئەنتەرنێت بەکار دەهێنن ئێمەی کوردیش پێویستمان بە ئەنتەرنێتە لە کوردستان بۆ خزمەت کردنی خاك و وولآتەکەمان دەتوانین سوودێکی زۆری لێ ببینین .

**بـۆ زانینـی چـۆنیەتی شـێوزای کـارکردن و شـێوازی بەشـداربون لـە سیـستەمی (Gprs ) لـە کۆمپانیـای کـۆرەك تیلیکـۆم بەرێز ( ئەمیر تەها شێروانی ) ئەندازیار لە کۆمپانیای کۆرەك تیلیکۆم دەلێت :**

ئەنتەرنێتی ناو مۆبایل ئەنتەرنێتێك نیە هەموو کارێکی لەسەر بکرێت بەڵکو بۆ پێداویستی سادەیە بۆ نمونە بەشداربوانی کۆرەك دەتوانن ئیمێل بکەنەوە یاخود بۆ (Ring ton) دابەزاندن چونکە لە هەموو دنیا لە سیستەمی ( Gprs ) ئەم سیستەمە سیستەمێکە بەس ئەو ئیمکانیەتە دەداتە بەشداربوویی خۆیی کەبتوانێ لەگەڵ ئەنتەرنێت بەشدار بێت واتا تەنها بۆ بەکارهێنانێکی ئاساییە بەشداربوو ناتوانێ (داونلۆدی ) قورسی پێ بکات چوونکە خێراییەکەی زۆر نیە تەنها نزیکەی (١٧٢ ) کیلۆ بایت لەیەك چرکەدا .



**لەوەڵامی پرسیاری خێرایی هێڵی سیستەمی ( Gprs ) بەڕێزیان ووتی :**

خێرایەکەی لەسەر ( نێت وۆرك ) واتا بەستنەوەی کۆمپیوتەرەکان دەمێنێتەوە بۆ نمونە لە هەموو وێستگەکانی ئێمە ڕێژە هەیە ئەگەر بێتوو بەشداربوو لەسەر شاخێکیش بێت پێویستی بە ئەنتەرنێت بێت دەتوانێ ئیشی خۆی بکات بەڵام خێرایەکەی لە هەموو کاتێکدا وەك یەك نیە دەبینین هەندێك کات هەیە پێ دەڵێن ( Busy hour) لەو کاتانەدا کە خەڵك زۆر پەیوەندی دەکات خێرایەکە باش نیە خاڵێکی تر هەیە بەڕێژە دەمێنێتەوە لە یەك وێستەگە چەند کەسانێك بەشداری ( Gprs ) دەکەن واتا ئەو ئیمکانیەتە هەیە کە چەند بەشدار بوویەك لەسەر یەك وێستگە بەشدار بن لە ئەنتەرنێت جا بۆیە لە هەندێك کات دەبینی خێرایەکەی کەم دەبێتەوە بە شێوەیەکە گشتی لە کوردستان کە ئێمە ( Serves ) ( Gprs )مان فرۆشتووە هەتا ( ٥٠ ) کیلۆبایت لە یەك چرکەدا داوە بە خەڵك لەگەڵ ئاریافۆن و ئەنتەرنێتی تر بەراوردمان کردووە لە زۆر شوێن خێرایی ( Gprs ) زۆر لەوانی تر باشتر بووە .

**سەبارەت بە ڕێژەی بەشداربووان نرخی بەشداربوون بەڕێزیان دەڵێت :**

بە شێوەیەکی گشتیی تاکو ئێستا نزیکەی ( ٢٠٠٠ ) بەشداربوومان هەیە بەڵام سیستەمی بەشداربوونەکە قورسە پرۆگرامی تریش هەیە لە داهاتوو بۆ ئەوەی هەموو لایەك( ئەکتیڤ ) بێت بە ( بایت ) حساب بکرێت واتا چەند ( کیلۆ بایت ) ڕابکێشی ئەوەندە بێت ئەگەر بێتوو بەراوردێکیش بکەین لە هیچ شوێنێکی دنیا ئەنتەرنێت وا هەرزان نیە کە ڕۆژی بە ( ١ $ ) کەمترە لە کۆمپانیای کۆرەك تیلیکۆم واتا بە ( ٢٥ $ ) دەتوانیت مانگانە بۆ ماوەی ( ٢٤ ) کاتژمێر بەشداری ئەنتەرنێت بکەیت .

**لە وەڵامی کێشە و گرفتەکانیش گووتی :**

ئێمە زۆر کێشەمان هەیە زۆر جار بەشداربووان کاتێك بەشداری ئەنتەرنێت دەبن نازانن بچنە دەرەوە وێستەگەکە داگیر دەکەن بە شێوەیەکی گشتی شێوازی بەکارهێنان لە لاێکی زۆر لاوازە بۆیە ئێمەش بەشی گروپی ( Gprs ) سیدیەکمان داناوە وەك یارمەتی و ڕێنمایی بۆ بەشداربووان وە لە پشتی گرێبەستەکان کەتەلۆکمان داناوە بەڵام بەداخەوە زۆر خەڵك نایخوێنێتەوە ئێمەش بە گوێرەی پێویست یارمەتییان دەدەین .

**سەبارەت بە ئامانجی بەکارخستنی ئەم سیستەمە لەکۆمپانیای کۆرەك تیلیکۆم بەڕێزیان دەڵێت :**

ئەگەر بەراودر بکرێت بەو ڕێژەیەی بۆ بەشداربووانی ئێمە هەمانە بە گرانی و هەرزانی کە دامان ناوە وەك بڵێی زۆرتر خزمەت دەگەینێ نەك بۆ لایەنی ئابووری و بازرگانی ئەگەر بیت و بەراود بکەین ( ٢٠٠٠ ) بەشداربوو چ لە ئێمە ناکات ئێمە سیستەمێکی گەورەمان داناوە چوار پێنج ئەندازیار کاری لەسەر دەکات لە بەرنامەشمان دایە بە هێزتری بکەین لە هەندێك شوێن ئەنتەرنێتەکەش ویستی خۆت بێت کە خێراییەکەی بکرێتە ( ٣٠٠ ) کلیۆبایت بە پێی ئارەزووی بەشداربووان هیواردارین توانیبێتمان خزمەتێك بگەێنین بە میلەتەکەمان و بە بەشداربووانی کۆرەك تیلیکۆم .







# ماڵپـــــەرە کوردیەکـــــان

زنجیرەی یەکەم

ئا/ نیشتمان

بۆ ئەوەی خوێنەرانی گۆڤارەکەمان ئاشنا بن بە سایتە کوردیەکان و زانیاریان هەبێت لەسەر سایتە کوردیەکان لە روی چەنداتیەتی و چۆنایەتی و هەروەها بتوانرێت سود لە سایتەکان وەربگرن بۆ زانیاری و بابەت و هەواڵ و بەرنامە بەزمانی شیرینی کوردی گۆڤاری کۆمپیوتەر بە زنجیرە لەهەموو ژمارەیەك کۆمەڵێك سایتی بەسود پێشمەش بە خوێنەرانی دەکات . بۆ ئەم جارە ٣٠ سایتی کوردی فرە بابەتی بۆ ئامادەکردون بەهیوای سود بینین :

1. http://www.hetawikurdistan.it هەمەرەنگ و سایتێکی بەتوانا
2. http://www.pertwk.com تایبەت بە پەرتوکی کوردی هەمەرەنگ
3. http://www.gzing.org هەمەرەنك و هۆنراوە و فرە بابەت
4. http://www.kurdishplatform.org وتارو بابەتی گشتی و هەمەرەنگ
5. http://www.kurdishlibrary.org پەرتوك خانەی کوردی
6. http://www.kurd.it تایبەت بە ئەنفال
7. http://www.kurdistanpost.com تایبەت بە هەواڵ وفرە بابەت
8. http://www.kurdistannet.org تایبەت بە هەواڵ و فرە بابەت
9. http://www.peyamner.com رۆژنامەی هاولاتی
10. http://www.hawlati.com تایبەت بە هەواڵ
11. http://www.krg.org حکومەتی هەرێمی کوردستان
12. http://www.nuserikurd.com بلاوکراوەی کلتوری کوردی
13. http://www.helwist.com تایبەت بە بلاوکراوەی گشتی وهەواڵی کوردی
14. http://www.kurdistansite.com بنکەی هەواڵ وراپۆرت و بۆچون
15. http://www.rojhalat.de سایتێکی هەمەرەنگی کوردستانی ئێران
16. http://www.shoresh.de هەمەرەنگ
17. http://www.rojhelat.net برافی ژنانی کورد
18. http://www.m-rasan.com گوڤاری راسان
19. http://www.dengekan.com سایتی دەنگەکان تایبەت بە هەواڵ و بابەت
20. http://www.xozga.com وێب لاگی کوردی
21. http://www.kurdland.com هەمەرەنگ
22. http://www.avestakurd.net ئاڤێستا سایتێکی فرە رەنگ و هەواڵنامە
23. http://www.kurdistandailynews.com تایبەت بە هەواڵ و پرسی سیاسی گەلی کورد
24. http://www.dilocan.info گۆرانی و کلیپی کوردی
25. http://www.garmyan.com تایبەت بە کتێب و سیدی
26. http://www.santarimnalan.com سایتی بەرگری کردن لە مندالان
27. http://www.keskesor.info/ku سایتی کەسك و سۆر هەمەرەنگ
28. http://www.kurdroj.com رۆژی کوردی هەمەرەنگ
29. http://www.kurdistan٤all.com تایبەت بە زۆربەی سایتە کوردیەکان
30. http://www.halabjamonument.com مۆنۆمێنتی هەڵەبجە

# دانانی (Google) لە ویندۆزی ڤیستا

ئا :دیار عەزیز
سەرچاوە : البوابة العربية

لە هەنگاوێکی نوێ و چاوەڕوان نەکراودا لەم دواییە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت گرتنە بەری سیاسەتێکی نوێی بۆ پێشخستنی سیستەمی ویندۆزە نوێیەکەی (ڤیستا) ڕاگەیاند ، ئەم سیاسەتە نوێیە خۆی دەبینێتەوە لەڕێگەدان بەدروستکارانی ئامێری کۆمپیوتەر بەدانانی بزوێنەری گەڕانی (Google) و سایتە بەناوبانگەکانی تری گەڕان لەناو ویندۆزی ڤیستا ، بەهەمان شێوە کۆمپانیاکە ئەم ڕاگەیاندنەی بۆ ئەو شەفافیەتە گێڕایەوە کۆمپانیاکە دەیگرێتە بەر بەمەبەستی کردنەوەی دەرگای ڕکابەری کردن لەنێوان دروستکارانی ئامێری کۆمپیوتەر لەلایەك و پسپۆڕانی بواری پێشخستنی بەرنامەکان لەلایەکی ترەوە.

لەهەمان کاتدا مایکرۆسۆفت لەهەوڵی پلان دانانە بۆ دەستەبەر کردنی خزمەتگوزاری یەکی نوێ ی گەڕانە تاوەکو بەهۆیەوە ڕکابەری خزمەتگوزاری گەڕانی (Google)ی پێ بکات لەویندۆزە نوێیەکەی لەکۆتاییدا کۆمپانیاکە پێشکەش کردن و بەکارهێنانی ویندۆزی ( ڤیستا )ی لەلایەن بەکارهێنەرانەوە خستە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧.

جێی ئاماژە پێدانە کۆمیسیۆنی ئەوروپی لەماوەیەکی پێشووتردا سزای ٢٨٠ملیۆن یۆرۆی خستبووە سەر مایکرۆسۆفت بەهۆی پابەند نەبوونی بەبەڵێنەکانی سەبارەت بەکاری ڕێخۆشکردنی لەلایەن کۆمپانیاکە بۆڕکابەری کردن مۆری کردبوو.



# هەواڵ پێدانی سایتێك کە چی بەسەر نامەکەتدا دێت

نووسینی // محمد عولا قادر - شەقڵاوە
Muhamed51@yahoo.com

ئەم سایتە خزمەتگوزارییەکی زۆر دەگمەن پێشکەش بەبەکارهێنەرەکانی دەکات، کەوا هەڵدەسێ بەهەواڵ پێدانت دەربارەی ئەو نامەی ناردووتە بۆ هەر کەسێك بێت، ئایا هەڵساوە بە خوێندنەوەی نامەکە یاخود نا ؟ چەند جار خوێنراوەتەوە ؟ وە هەرجارێك لەخوێندنەوەی چەن کاتی خایاندوە ؟ وە چەند نامەکەی کردووەتەوە وە خستوویەتە پشت باکگراوندەوە ( واتە بەرنامەیەکی تری کردۆتەوە )، وە ئایا هەڵساوە بەناردنەوەی بۆ پۆستێکی تر، وە چندین خزمەتگوزاری تر ... ، کە بەڕاستی سایتێکە خزمەتگوزاری جوان پێشکەش دەکات، بەلاّم لەوانەیە بۆ کەسانێك دڵتەنگیەك دروست بکات بەوەی کە نایانەوێ کەس بزانێت کە نامەیان بۆ هاتووە ، وە ئایا خوێنراوەتەوە یاخود نا ؟. ناونیشانی سایتەکە بریتی یە لە http://www.readnotify.com ، وە داوای زانیاری کەسی زۆرت لێ ناکات ، وە پێویستت ناکات بەدابەزاندنی بەرنامە بۆ نێو ئامێرەکەت، بەڵکو بەتۆمارکردنی ناوێك و ووشەی تێپەڕبوون کردارەکە کۆتایی دێت، وە پێویستیەکان تەنها بریتی یە لە نوسینی ئەم بەشە نووسینە readnotify.com لە دوای ناونیشانی ئیمەیڵی ئەو کەسە ، بۆ نمونە ئەگەر ناونیشانی ئیمەیڵ بەم شێوەیە بوو kameran76@walla.com ، ئەوا دەبێتە kameran76@walla.comreadnotify.com ، وە دەتوانرێ هەر ڕێگایەك بەکاربهێنرێت بۆ ناردنی نامە ، هەر لەسایتی بەشداربووی پۆستەکە یاخود بەرنامەی outlook express ، وە هەروەها دەتوانی هەر لەم سایتەوە نامەکانت بنێری

بەلاّم چۆن بزانین چی بەسەر نامەکانمان دادێت ؟ لە وەلاّمدا دەڵێین چەن هەڵبژاردەیەکمان هەیە بۆ ئەم کارە، یان دەچین بۆ نێو ئەم سایتە وە ناوی بەکارهێنەر لەگەڵ ووشەی نهێنی دەنووسین، وە دوایی دەچین بۆ بەشی (رسائلك– your message)، بۆ ئەوەی لیستی نامەکانمان بۆ بەدیار کەوێت کە ناردوومانە، لەهەر شوێنێك بێت کە ناردوومانە،وە لیستەکە پێکهاتووە لە خشتەیەك کەخانەکانی بەرواری کردنەوەی نامەکان و ناونیشانی ئەوکەسەی بۆت ناردووەو بابەتی نامەکەو وە خانەی ئایا نامەکە کراوەتەوە یان نا، وە ئەگەر نامەکەت کرابووەوە لەلایەن کەسی بەرامبەرەوە ئەوا لەلیستەکەدا بەرواری کردنەوەکە نیشان دەدات لەنێو ئەم سایتەدا، وە دەتوانین زانیاری زیاتر بەدەست بخەین بەکلیك کردن لەسەر بەرواری کردنەوەکە، ئایا چەند جار نامەکە خوێنراوەتەوە؟ وە ئایا ناردوویەتیەوە بۆ کەسێکی تر؟ وە چەند جار نامەکەی کردوەتەوە وە خستویەتە ژێر باکگراوندەوە؟ وە بەرنامەیەکی تری کردۆتەوە ، وە هەروەها پێت دەڵێت دەربارەی جۆری سیستەمی کارپێکردنی بەکارهێنراوەکە ئایا ویندۆز٩٥ یان ٩٨ یان ٢٠٠٠ یان .....هتد ، وە هەروەها جۆری بەرنامەی بەکارهێنراو یاخود سایتی بەکارهێنراو بۆ کردنەوەی نامەکە، وە هەتا ژمارەی IPای تایبەت بەو ئامێرەی کە لەسەریەتی ( بەڕاستی خزمەتگوزارییەکی ترسناکە)، یان هەڵبژاردەی دووەم کە بزانیت چی بەسەر نامەکانتدا هاتووە، ئەویش بەهەڵبژاردنی ئەوەی کەوا سایتەکە خۆی نامەیەکت بۆ بنێرێت وەهەواڵت پێ بدات دەربارەی کردنەوەی نامەکەت هەرلەوکاتەی کەدەیکاتەوە، یاخود بەپێ ی بەروارێك کەخۆت دایدەنێیت وە چەندین خزمەتگوزاری تر کەدەتوانین دیاریان بکەین، وە هەڵبژاردەی سێ یەم بریتی یە لەئاگادارکردنەوەی خوێندنەوەی نامەکانت لەڕێ ی کورتە نامەی مۆبایل SMS، وە هەروەها سایتەکە لەبەرنامەیدایە هەواڵت پێ بدات لەڕێی بەرنامەکانی ICQ وmessenger ، وە لەڕاستیدا ئەوەی ئەم سایتە پێ ی هەڵدەسێ بریتیە لەوەی کەوا ئەوبەشەیەی زیادی دەکەین بۆ ناونیشانی نامەکە کە بریتیە لە ( readnotify.com)، والەنامەکەت دەکات کەبە

سێرڤەری ئەم سایتەدا بڕوات، وەلەمەوە سێرڤەرەکان هەڵدەسن بەزیادکردنی چەند ڕەمزێکی پرۆگرامی تایبەت، بۆ بەدواداچوونی نامەکە(Tracking code)، وەلەو کاتەی نامەکە دەخوێنرێتەوە دووبارە ئەم ڕەمزانە دەگەڕێنەوە هەمان سێرڤەری ئەم سایتە لەگەڵ کات و بەرواری خوێندنەوەی نامەکە، وە لەوێدا خەزن دەکرێن لە ئەرشیفی بەکارهێنەرەکە، یاخود دەنێردرێ بۆ پۆستەکەی لەشێوەی نامەیەك ، وە یەکێکی تر لەتایبەتمەندییەکانی ئەم سایتە ئەوەیە کەدەتوانی زیاد لەچەندین ناونیشانی پۆستە بنووسیت، بەڵام دەبێ یەك ناونیشان دیاری بکەیت بۆ هەواڵ پێدانت .

لە کۆتاییدا پرسیارێکی گرنگ دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە ئایا دەکرێ خۆمان دەربازبکەین لەخزمەتگوزاری ئەم سایتە؟ بەوەی نامەکە بخوێنرێتەوە وە سایتەکە پێ ی نەزانێت، وە نێرەری نامەکە نەزانێت کەوا ئایا نامەکەی خوێنراوەتەوە یان نا، وەڵامەکەی بریتیە لە بەڵێ وە نەخێر لەهەمان کاتدا ، چونکە سایتەکە خۆی دەیڵێت کەوا لەهەندێ کاتدا سایتەکە ناتونێ کەشفی ئەم حاڵەتە بکات .

ReadNotify
Welcome to ReadNotify.com !
ReadNotify lets you know when email you've sent gets read
Length of Reading
Find out how long they read your email for
track your email
Member Sign-in
email:
password:
Sign-in
Sign up now - Free!
Your existing email address:
GO!
Start here!
Optional Plugin
PDF Tracking
kameran7605@yahoo.com
home

١. هەڵسان بەخوێندنەوەی نامەکە کە لەحاڵەتی پەیوەندی کردن نەبیت بە ئینتەرنێتەوە ( offline)، بۆ نمونە لەکاتی هاتنی نامەیەك بۆمان لە بەرنامەی outlook express وە بێ ئەوەی سەهمی ماوس بخەینە سەر نامەکە، پاشان پەیوەندی بەتۆڕی ئینتەرنێت بپچڕێت، لەو کاتەدا ئەم سایتە ناتونێ کەشفی ئەم حاڵەتەی خوێندنەوە بکات، وە هیچ نامەیەك بە دەستی نێرەری نامەکە ناگات،

٢. هەندێ پرۆگرامی کۆنی پۆستی ئەلیکترۆنی ناتوانێ مامەڵە لەگەڵ ئەم خزمەتگوزاریە بکات ، لەبەرئەوە نێرەری نامە هیچ هەواڵێکی پێناگات دەربارەی خوێندنەوەی نامەکەی، هەڵبەتە ئەو پرۆگرامانە ئێستا زۆر کەم بەکاردێن .

٣. هەندێ لە کۆمپانیا توندڕەوەکان و دام و دەزگای سەربازی سیاسەتێکیان هەیە کە دەبێتە هۆی قەدەغەکردنی هەواڵ پێدانی ئەوکەسەی کەوا نامەی ناردووە بۆیان، لەبەرئەوە ئەم خزمەتگوزاریە کارناکات لەگەڵ ئەمانە.

٤. هەواڵ دەگاتە دەستی نێرەری نامە ئەگەر مرۆڤ نامەکە بخوێنێتەوە، بەڵام ئەگەر مرۆڤی ئالی ( ڕۆبۆت) بیخوێنێتەوە ئەوا هیچی بەدەست ناگات، یاخود ئەگەر بەرنامەیەکی تایبەت دابنرێت بۆ وەڵامدانەوەی نامەکان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی .

# ٣٠ ڕێگا بۆ پاراستنی پۆستی ئەلکترۆنی لە شکاندن ودزین

ئا: جوتیار عبدالجبار



گومانی تیادانییە کە لەرۆژگاری ئەمرۆدا پۆستی ئەلکترۆنی رۆلێکی گرنگی بینیوە لە گواستنەوەی هەواڵ و زانیارییەکان لە نێوان مرۆڤەکاندا ، کە لە ڕێگەیەوە دتوانرێت نامە و پەڕگە (فایل)ی جۆراو جۆر بنێرێت نمونەی پەڕگەی وێنە و بەرنامە و زۆر بابەتی تر ، وە بەرچاوترین سوودی پۆستی ئەلکترۆنی بریتییە لە گفتوگۆکردن (چات) کە زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگای بە خۆیەوە پەیوەست کردوە . لەبەر ئەو سودانەی کە پۆستی ئەلکترۆنی هەیەتی ،پۆستی ئەلکترۆنی وەکو پێویستییەکی تری ڕاپەراندنی ژیانی لێهاتووە شان بە شانی ئامێرەگرنگەکانی وەکو تەلەفون ومۆبایل و فاکس هتد. هەر لەبەرئەوەشە کە ژمارەی ئەو کەسانەی کە فۆرمی بە ئەندام بوونی پۆستی ئەلکترۆنی پڕدەکەنەوە لە زیاد بوون دایە ، بۆ ئەم مەبەستەش جۆرەها ماڵپەردروست کراون کە پۆستی ئەلکترۆنی پێش کەش بە بەکارهێنەرانییان دەکەن جا ئەو پۆستە بە پارە بێت یان بە خۆڕایی. بێگومان ئەم پۆستە ئەلکترۆنییانە زانیاری تایبەت بە کەسەکانی پێ دەگوێزرێتەوە لەبەر ئەوە پێویست بە بونی وشەی تێپەڕ بوون یان وشەی نهێنی دەکات ئەمەش بۆ ئەوەیە کە تەنها خاوەنی پۆستە ئەلکترۆنییەکە بتوانێت ڕەفتاربە پۆستەکەی خۆیەوە بکات. بەڵام هەندێک جار پۆستە ئەلکترۆنییەکان ڕووبەڕووی شکاندن و دزین دێن لە لایەن هاکەرەکانەوە ، ئەویش بە بەکارهێنانی بەرنامەی تایبەت بەو بوارە کە ئەم بەرنامانە لە توانایاندا هەیە وشەی تێپەڕبوونی پۆستە ئەلکترۆنییەکان بشکێنن وە پاشان ڕەفتار پێوە کردنی پۆستە ئەلکترۆنییەکە لە لایەن کەسی بەکارهێنەری ئەو جۆرە بەرنامانە واتە (هاکەر) .



لە بەر ئەوە بۆ ئەو کەسانەی کە پۆستی ئەلکترۆنییان هەیە وە ئارەزوی ئەوە ناکەن کە کەس وشەی تێپەڕبوونی پۆستە ئەلکترۆنییەکەیان بزانێت وە بە دوای ڕێگا چارەدا دەگەڕێن بۆ ئەو مەبەستە ، ئەوا لێرەدا (٣٠) ڕێگا بۆ پاراستنی پۆستە ئەلکترۆنییەکەیان لە شکاندن خراوەتە ڕوو کە بێگومان سوودی لێ دەبینرێت بۆ پاراستنی پۆستی ئەلکترۆنی

١ـ وشەی تێپەڕبوون کورت تر بێت ئەگەری شکاندنی زیاترە.

٢-وشەی تێپەڕبوون بریتی بێت لە تێکەڵی هێما و ژمارە و پیت وەکو ئەم شێوەیە: (MYO~QM/+_^%BO*ZP319)

٣-وشەی تێپەڕبوونێک دانەنرێت کە بتوانرێت بە ئاسانی بەهۆی تەختەکلیلەکە (کیبۆرد)وە بنوسرێت ، هەرچەندە ئەو دوو مەرجەی سەرەوەشی تیادا بێت ، واتە ئەگەر بەم شێوەیە بوو ئەوا ئەگەری شکاندنی زیاترە: (~!@#$%^&*QWERTYUIOP123) ئەگەرلەو وشەی تێپەڕبوونەی سەرەوە ورد ببینەوە تێبینی ئەوە دەکەین کە ئاسانکاری هەیە لە داخڵ کردنی پیتەکان و ژمارەکان و هێماکان لەبەر ئەوەی بەڕیز داخڵ دەکرێن یەکەم جار پیتەکان کە دەکەونە بەشی سەرەوەی تەختەکلیلەکە بەدوای ئەودا ژمارەکان داخڵ دەکرێن کەدەکەونە سەروی پیتەکان لەسەر تەختەکلیلەکە وە بەدوای ئەمیش دا هێماکان داخڵ دەکرێن کە ئەمانیش بە داگرتنی کلیلی شەفت و بەکارهێنانی کلیلەکانی ژمارەکان کە دەکەونە سەروی کلیلی پیتەکان داخڵ دەکرێن ، لەبەر ئەوە وا باشترە کە جوڵە هەبێت لە نێوان کلیلەکانی سەر تەختە کلیلەکە وە بە شێوەیەکی هەڕەمەکی وشەی تێپەڕبوون بنوسرێت تا بە گرانی بتوانرێت ئەو وشە تێپەڕبوونە بخەمڵێنرێت یان بدۆزرێتەوە .




-وشەی تێپەڕبوون بریتی نەبێت لە ژمارەی بە دوای یەکدا هاتوو تەنانەت بریتیش نەبێت لە ژمارەی تێکەڵ ، لە گەڵ ئەوەی تۆ وای دەبینیت کە گران بێت شکاندنی بەڵام لێرەدا بەرنامەی تایبەت هەیە بۆ دەرخستنی وشەی تێپەڕبوون جا ژمارەکان بەدوای یەکدا هاتبن یان تێکڵ بن هەرچەندێک ئەو وشەی تێپەڕبوونەش درێژ بێت ، وەکو ئەم شێوانەی خوارەوە:

(١٢٣٤٥٦٧٨٩ یان ١٢٢٢٣٣٤٤٤٤ یان ١٠٢٠٣٠٤٠٥٠٦ )وە بەو شێوەیە....

٥-باشتر وایە کە وشەی تێپەڕبوون دوور بێت لە هەر زانیارییەکی ڕاستی کە پەیوەندی بە خۆتەوە هەبێت وەکو ژمارەی تەلەفون یان ناوی خۆت یان ناوی شارەکەت یان ناوی دەوڵەتەکەت یان ڕۆژی لە دایک بوونت چونکە ئەم جۆرە ووشە تێپەڕبوونانە ئەگەری شکاندنی زیاترە.

٦-وشەی تێپەڕبوون دوور بێت لە ناوە بەناو بانگەکانەوە وەکو ناوی یاری زان یان ناوی گۆرانی بێژ ، ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەم جۆرە وشانە نزیکە لە بیرکردنەوەوە وە بە ئاسانی دەخەملێنرێت .

٧-ئەبێت باوەڕت بەو کەسە هەبێت کە پۆستی ئەلکترۆنی بۆ دەنێریت لەبەرئەوەی ئەوکەسەی کە تۆ پۆستی ئەلکترۆنیت بۆ ناردوە دەتوانێت دوای ماوەیەک لە وەرگرتن و پێدانی پۆستی ئەلکترۆنی زانیاری تایبەت بە پۆستە ئەلکترۆنییەکەت کۆبکاتەوە وە سوودی لێ ببینێت بۆ دەرخستنی وشەی تێپەڕبوونی پۆستە ئەلکترۆنییەکەت.




٨- وشەی تێپەڕبوون بریتی نەبێت لە ناوی نێنەری پۆستی ئەلکترۆنی (مەبەست لە نێنەری پۆست واتە(Yahoo,Google,.....) ئەگەر ناوێکی زیاد کراویشی لە گەڵدا بێت وەکو ئەم نمونەیەی خوارەوە:

(snowfallasowfallitgoyahoocom)

٩-وا باشترە کە وشەی تێپەڕبوون بگۆردرێت لە نێوان ماوەیەک بۆ ماوەیەکی تر .

١٠-ئەگەر زیاتر لە پۆستێکی ئەلکترۆنیت هەبێت وا باشترە کە هەر یەکەیان وشەی تێپەڕبوونی تایبەت بە خۆی هەبێت ،لە بەر ئەوەی ئەگەر هەمان وشەی تێپەڕبوونیان هەبێت ئەوا شکاندنی وشەی تێپەڕبوونی یەکێکیان بەسە بۆ شکاندنی وشەی تێپەڕبوونی ئەوانی تریش.



# ODC بۆ داونلۆدکردن

ئا: محمود محمد حسن ساڵەیی
mehmud_felek@yahoo.com

ئێمە کاتێك ئەچینە سەر هێڵی ئینتەرنێت و بمانەوێ شتێك دابەزێنین لەوانەیە نەتوانین وەکو پێویست ئەو بەرنامەیە کە ئێمە پێویستمان پێ ی هەیە دەستمان کەوێ، ئینجا لێەردا ئەم پرۆگرامە کاری ژوورەکان و (Hub)مان زۆر بە سانایی بۆ ئەنجام ئەدات بگرە لەوانەیە هەندێ کلیپ و فیلم دابەزێنی کە هێشتا بلاو نەکراوەتەوە لە بازاڕەکاندا کە تۆ وەکو بەشدار بوویەك ئەچیت هێڵی کۆمپیوتەرەکەت بە هێڵێکی جیهانی یەوە ئەبەستیتەوە واتە تۆ لە ئامێری خەڵك شت ئەهێنی و خەڵکیش بەهەمان شێوە شت لە ناو ئامێرەکەت ئەبەن. بۆ دابەزاندن پرۆگرامەکە لە بەشی گەڕانی (Google)بنووسە (Odc)و پاشان دایبەزێنە کە تەنها قەبارەکەی (١,٨٥ mb)ەو بەخۆڕاییە دوای دابەزاندن (Install)ی بکەو ئەم هەنگاوانە بکە:

بەرنامەکە بکەوەو بەشی (Setting) دابگرەو لە بەشی (General)بەناوێك بڕۆرە ژوورەوەو ئیمەیلەکەت بنووسەوە. وەکو وێنە ژمارە (١):

ئینجا ئەچینە سەر بەشی (Download) بەشی (Browse) دائەگرین لە هەردوو شوێنەکەدا بۆ ئەوەی شتە دابەزێنراوەکان لەو شوێناندا هەڵبگیرێن و لە بەشی (Limits) یەکەم وەکو خۆی دەست کار مەکەو دووەمیان بکە بە ژمارەیەك بۆ نموونە (٥) واتە ئەگەر دابەزاندنەکە لە (٥) کیلۆ بایت کەمتر بوو وازی لێ بێنە و لە دواییدا (Enter) دابگرە لە سەر بۆردی دوگمەکان. وەکو وێنە (٢):







ئینجا بەشی (A) واتە (Public Hubs) دابگرە بۆ چوونە ناو ژوورەکانەوە.

(B) (Download Queue) بۆ بینینی ئەو زانیارییانەیە کە ئێستا دائەبەزێ.

(C) (*Finishid Download*) بۆ بینینی زانیارییە دابەزێنراوەکان.

(D) (Finishid Uploads) بۆ بینینی ئەو شتانەی کە خەڵك ئەیبەن.

(E) (Favorite Hubs) بۆ بینینی ئەو زانیارییانەی کەپێشتر داتبەزاندووە.

(F) (Favorite Users) بۆ بینینی ئەو کەسانەی کە پێشتر زانیاری دابەزاندووە.

(G) (Search) کە گرنگترین بەشە و ئێمە مەبەستمانە. وەکو وێنە (٣):

ئینجا ئێمە ئەچینە سەر بەشی (Gneral) لە بەشی (Filter) بۆ نموونە ئەمانەوێ بچینە ژوورە کوردییەکانەوە ئەنووسین (kurdish) و لە (Manual connect address)یشدا ئەنووسین (music)و (Enter) دائەگرین و چاوەڕێ ئەکەین تاوەکو ئەچینە ناو ژوورە کوردییەکان و لەوێشەوە بە دەبڵ کلیك ڕاستەوخۆ ئەچینە ناو ژوورە تایبەتەکەوە. ئێمە مەبەستمان دەست کەوتنی زانیارییە بۆیە ئەچینە سەر بەشی (Search)و ناوی ئەو شتە ئەنووسی کە ئەتەوێ بۆ نموونە (Chopy) لە بەشی (Type) کەشی ( ,Videoیان ... Audio.هتد) و ( Enter) دابگرەو چاوەڕێ بکە گۆرانیەکانی (چۆپی)ت بۆ دێتە پیشەوە و تۆش بە تەنها دەبڵ کلیك لەسەری بکە بەخێراییەکی باش بۆت دائەبەزێنی. وەکو وێنە (٤):

شوێنی بینینی زانیارییەکان
ODC
ژمارە ٤
شوێنی شتە داونلۆد کراوەکان

# ناساندنی ئامێری ZTE
# بەچەند هەنگاوێکی کورت

ئا: گزران هەریری

وەك دەزانرێ ماوەیەکە هێلی خزمەتگوزاریی ئەنتەرنێتی بێ تەل ( wireless) بلاوبونەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیەوە لە شاری هەولێر ، یەکەمین هەنگاو و هەولی سەرکەوتوو لەلایەن کۆمپانیای ( dalia sat ) ەوە بوو . ئەم کۆمپانیایە تاوەکو ئێستا دوو نەوەی ئامێری بێ تەلی پەیوەندی هێناوەتە هەولێر ( یەکیەمیان ناسراوە بە huawei و ئەوەی تریان ناسراوە بە ZTE) هەنگاوەکانی ناساندنی ئامێری یەکەم گشت کەسێك بێ گیروگرفت دەیکەن بۆ ئەوەی بتوانن بە سووك و ئاسانی سوود لە خزمەتی ئەنتەرنێتی بێ تەل وەربگرن لە مالێ یاخود لە فەرمانگە و کۆمپانیاکانی خۆیان ، بەلام ئەوەی تێبینیم کردبێت لە ناساندنی ئامێری دووەم زۆر لە ناسیاو و برادەران هاموشۆیان کردم بۆ ئەوەی بزانن کە بۆچی ئامێرەکانیان پێ دانامەزرێت و ناتوانن بیناسێنن لەسەر کۆمپیوتەرە تایبەتییەکانی خۆیان . لێرەدا بە چەند هەنگاوێکی کورت و خێرا بەیەکەوە ئەم ئامێرە دەناسێنین :

١ – سی دی یەکەی هاوپێچ کراوی ئامێری ZTE دەکەینەوە لەسەر کۆمپیوتەر و ، دەچین بۆ فایلی ناونراو بە : usb driver و کلیك دەکەین لەسەر ئایکۆنی driver ە کە بۆ ناساندنی و تا دوا هەنگاو کە : finish بەردەوام دەبین ( ئەم هەنگاوە زۆر کورت و خێرا بەرێوە دەچێت ) .



وێنە ١

٢ – دوای ناساندنی driver ەکەی ناو سی دی هاوپێچ کراو ، ئینجا دێن ئامێری ZTE ی بە هۆی ئەو کێبلی پەیوەندداری نێوان ئەو و کۆمپیوتەر بەیەکەوە دەیبەستینەوە بە هۆی کەلێنی USB .

٣ – لێرەدا کۆمپیوتەر داوای ئەوەت لێ دەکات کە فایلێك هێشتا ماوە و تکایە سی دی یەکە دابنێ و برۆ بۆ ئەوەی تەواو ئامێرەکەت بناسێنیت، ئەوەی گرنگە کلیك بکەیت لەسەر no, not this time وەك لە وێنەی ژمارە ( ١ ) دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر فەرمانی next .

٤ – لەو پەنجەرەیەی دوایی ئەوەیان هەلبژێرە : install form a list or specific location ( advanced) و ، کلیك بکە لەسەر next، پەنجەرەیەکی ترت بۆ دێت لەم پەنجەرەیە کلیك بکە لەسەر browse، پەنجەرەیەکی بچووکت بۆ دەکرێتەوە بەم شێوەیە بە دوای فایلە درووستبووەکە بگەرێ :

My computer ---- local disk (c: ) --- program files --- zte ---- zte_usbdriver--- win2k&xp

دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر ok وە next وپەنجەرەیەکت بۆ دەکرێتەوە continue anyway دابگرە و ئینجا finishلە پەنجەرەی سەرەکی دابگرە ، بەم شێوەیە تەواو driver ی ئامێری ZTE ی بە تەواوی دەناسێنیت لەسەر کۆمپیوتەری خۆت .

بیرۆکە : ئەوەی ناساندنی ئەم ئامێرە جیا دەکاتەوە لەوەی پێشووتر ، لە هەنگاوەکانی ناساندنی ئامێری ZTE ئەو فایلەی کە پێویستە بۆ تەواو ناساندنی ، دوای install کردنی driver ەکەی ناو سی دی یەکە ئینجا دروست دەبێت و دەچێتە نێو فایلی تایبەتی خۆی لە program files لە :partition c ، کە پێچەوانەی هەنگاوەکانی ناساندنی ئامێری huawei یە ، چونکە فایلەکان گشتیان لە کاتی ناساندن دەدۆزرێنەوە بە بوونی cd یەکەی ناساندنی هاوپێچ ، بە واتایەکی تر دوای install کردنی driver ەکەی ناو سی دی یەکە دەتوانیت سی دی یەکە دەربێنین و کارەکانی خۆمان تەواو بکەین کە هاوپێچی هەنگاوەکانی ناساندنی ئامێری huawei یە کە پێویست دەکات سی دی کە بەردەوام لە کارکردن بێت تا تەواو ناساندنی ئامێرەکە .

هەنگاوەکانی دانانی پەیوەندار بە ئەنتەرنێت – بە خێرایی

1.Start --- all programs --- accessories --- communications --- new connection wizard ( click )
2.New windows : next --- next --- setup my connection manually --- next --- next

ئەگەر هاتوو هەر قورسە بەشی ( hardware ) یَکی ترت هەبوو وەك مۆدم ( modem ) یان نەرمەبەشی ( software ) تایبەت بە کارکردنی هەر مۆدمێکی تری بەستراو بە کۆمپیوتەرەکەت جیا لەوەی ZTE ئەوا وەك وێنەی ژمارە ( ٢ )




qualcomm USB Modem هەڵدەبژێرین کە تایبەت بە ئامێری ZTE. ئینجا next

3.ISP --- هەر ناوێك بۆ نموونە : گۆران یان کوردستان ئینجاnext
4.Phone number : #777
5.User name : edjv password : edjv confoirm password : edjv --- next

وێنە ٢




لە کۆتاییدا کلیك دەکەین لەسەر ئەو چوارگۆشەیەی وەك لە وێنەی ژمـــارە ( ٣ ) دیاریکراوە ، بۆ ئەوەی کورتکراوەی پەیوەنداری ئەنتەرنێت لەسەر desktop پەیا ببێت ، بۆ ئاسانی پەیوەندی کردن بە ئەنتەرنێت .

وێنە ٣

# هەموو کلیلە کورتکراوەکان (Shortcut Keys) ی بەرنامەی Photoshop

عبدالرحمن علی
abdolrahmn4689@yahoo.com

## Edit

| | |
|---|---|
| Clear (selection) | Delete / Back |
| Copy | Ctrl+C |
| Cut | Ctrl+X |
| Free Transform | Ctrl+T |
| Paste | Ctrl+V |
| Transform Again | Ctrl+Shift+T |
| Undo/Redo | Ctrl+Z |

## Select

| | |
|---|---|
| All | Ctrl+A |
| Deselect | Ctrl+D |
| Feather | Ctrl+Alt+D |
| Inverse | Ctrl+Shift+I |
| Reselect | Ctrl+Shift+D |

## Image

| | |
|---|---|
| Color Balance | Ctrl+B |
| Curves | Ctrl+M |
| Hue/Saturation | Ctrl+U |
| Invert | Ctrl+I |
| Levels | Ctrl+L |

## Navigation

| | |
|---|---|
| Last Filter | Ctrl+F |

## File

| | |
|---|---|
| Close | Ctrl+W |
| Close All | Ctrl+Alt+W |
| Exit | Ctrl+Q |
| New Document | Ctrl+N |
| Open | Ctrl+O |
| Print | Ctrl+P |
| Revert | F12 |
| Save | Ctrl+S |
| Save As | Ctrl+Alt+S |

## View

| | |
|---|---|
| Fit on Screen | Ctrl+0 |
| Grid | Ctrl+' |
| Guides | Ctrl+; |
| Rulers | Ctrl+R |
| Zoom In | Ctrl++ |
| Zoom In / Resize Window | Ctrl+Alt++ |
| Zoom Out | Ctrl+- |
| Zoom In / Resize Window | Ctrl+Alt+- |

## Navigation

| | |
|---|---|
| Move View to Bot. Right | End |
| Move View to Top Left | Home |
| Next Document | Ctrl+Tab |
| Previous Document | Ctrl+Shift+Tab |

## Tools

| | |
|---|---|
| Decrease Brush Size | [ |
| Increase Brush Size | ] |
| Crop Tool | C |
| Eraser Tool | E |
| Gradient Tool | G |
| Pen Tool | P |
| Pattern Stamp Tool | S |
| Type Tool | T |
| Move Tool | V |
| Magic Wand Tool | W |
| Zoom Tool | Z |
| Hand Tool (toggle) | Space |

## Window

| | |
|---|---|
| All Palettes | Tab |
| Brushes Palette | F5 |
| Color Palette | F6 |
| Info Palette | F8 |
| Layers Palette | F7 |

## Layer

| | |
|---|---|
| Bring Forward | Ctrl+] |
| Bring to Front | Ctrl+Shift+] |
| Merge Layers | Ctrl+E |
| Merge Visible | Ctrl+Shift+E |
| Send Backward | Ctrl+[ |
| Send to Back | Ctrl+Shift+[ |

# Add Remove Plus
# بۆ سڕینه‌وه‌ی ئه‌و به‌رنامانه‌ی كه‌ ناسڕدرێنه‌وه‌




ئا: عبدالرحمن
Abdolrahman4689@yahoo.com

ئه‌م به‌رنامه‌یه‌ به‌ كاردێت بۆ سڕینه‌وه‌ uninstall ی ئه‌و به‌رنامانه‌ی كه‌ له‌ ناو control panel له‌ Add Remove Programs ده‌مێننه‌وه‌ و لاناچن، ئه‌م به‌رنامه‌یه‌ زۆر به‌ ئاسانی لایان ده‌بات و ده‌یانسڕێته‌وه‌ به‌ بێ ئه‌وه‌ی هیچ فایلێكی لێ بمێنێته‌وه‌ :

پێشه‌كی كه‌ به‌رنامه‌كه‌ ده‌كه‌ینه‌وه‌ ویندۆیه‌كمان دێته‌ پێش، وێنه‌(١)

Welcome

Welcome to Innovatools Add/Remove Plus!

Uninstaller Options:

Normal uninstall — سڕینه‌وه‌ی ئاسایی

This option will display all the applications which can automatically be uninstalled from your computer (program with an associated uninstaller). Just select the application from the list and choose Uninstall program.

Assisted uninstall

Select this option to remove any existing application from your computer (for example, applications which do not have an associated uninstaller). Just follow the steps in each screen to complete uninstalling the program.

Show this Welcome dialog box at startup — كلیك لێره‌ بكه‌ → Continue

وێنه‌ی (١)

دوو هەڵبــژاردەی تێدایــە، هەڵبــژاردەی یەکــەمیان Normal uninstall و هەڵبــژاردەی دووەمیــان Assisted uninstall، هەڵبژاردەی یەکەم Normal uninstall: پرۆگرامەکان بە شێوەیەکی ئاسایی ڕیزکراون ئەو پرۆگرامەی کە دەمانەوێت بیسڕینەوە uninstallی بکەین دەبڵ کلیکی لەسەر دەکەین ئنجا کلیك لەسەر uninstall دەکەین ئنجا کلیك لەسەر continue دەکەین ئنجا Clean-up بەرنامەکە دەسڕێتەوە وێنە(٢)



وێنەی (٢)

بەڵام ئەگەر بمانەوێت تەنها لە ناو Control panel دا نەمێنێت، ئەوا کلیکی لای ڕاست لەسەر ئایکۆنی بەرنامەکە دەکەین و Delete from list هەڵدەبژێرین و کلیك لەسەر Delete دەکەین، وێنە(٣).



وێنەی (٣)

هەڵبژاردەی دووەم Assisted uninstall : لەم هەڵبژاردەیەدا، وێنە (٤)

Welcome

Welcome to Innovatools Add/Remove Plus!

Uninstaller Options:

Normal uninstall

This option will display all the applications which can automatically be uninstalled from your computer (program with an associated uninstaller). Just select the application from the list and choose Uninstall program.

Assisted uninstall — سڕینەوەی یارمەتی دراو

Select this option to remove any existing application from your computer (for example, applications which do not have an associated uninstaller). Just follow the steps in each screen to complete uninstalling the program.

وێنەی (٤)

Show this Welcome dialog box at startup — کلیك لێرە بکە → Continue

پڕۆگرامەکان بەشێوەی یەك لەدوای یەك ڕیز کراون، ئەو بەرنامەیەی کە دەمانەوێت بیسڕینەوە دەستنیشان (تحدید)ی دەکەین پاشان Next دەکەین، وێنە(٥)

Assisted Uninstall

Application's location

The first thing you have to do is to select the applications you want to remove from your computer.

You can select the Desktop Icon of the application, by checking the boxes in front of the desired application icons or add the name of the applications, by clicking the Add file button and locating the file.

لێرە ئەو بەرنامانە هەڵدەبژێرین کە دەمانەوێت بیانسڕینەوە

Select the application's Desktop Icon

| Name | Path |
|---|---|
| Adobe Photos... | C:\Program Files\Adobe\Photoshop 7... |
| Counter Strike... | C:\Program Files\Counter Strike Sour... |
| Internet | |
| Paltalk Messe... | C:\Program Files\Paltalk Messenger\... |
| Upgrade Paltalk | |
| word | C:\WINDOWS\Installer\{90110409-6... |

Select the name of the application

| Name | Path |
|---|---|

وێنەی (٥)

Add file | Remove file

ئنجا کلیك لێرە دەکەین

Help | < Back | Next > | Cancel

ئنجا ئەو فۆڵدەرانەی کە دەمانەوێت بیانسڕینەوە دەسنیشانیان دەکەین دووبارە Next دەکەین، وێنە(٦)، تا کۆتایی ئنجا Finish دەکەین.




وێنەی (٦)

بەم شێوەیە دەتوانین ئەو بەرنامانە بسڕینەوە کە پێشتر پێمان نەدەسڕایەوە.

# Recover My Files 2.90

# گەڕاندنەوەی فایلە سڕاوەکان

ئا: هێرۆ هاشم

یەکێك لە بەهێزترین بەرنامەکانی گەراندنەوەی فایلە لەپاش رەشکردنەوەی فایل بەرێزان من خۆم تاقیکردنەوەم لەسەر ئەو بەرنامەیە هەیە بەراستی شتێکی زۆر گرنگە بەڵکو ئێستا تۆ بە بچووکی سەیری ئەوبەرنامەیە بکەیت بەلام لەوکاتەی کە شتێکی گرنگت لێ رەشدە بێتەوە لەوکاتە زۆر زۆر پێویستیت بەو بەرنامەیە دەبێت هەروەها ئەم بەرنامەیە هەرتەنها کاری ئەوە نی یە تۆ ئێستا شتێکت لێرەش بۆتەوە ئەوکاتە شتەکەت بۆ بێنێتەوە بەڵکو پاش فۆرماتکردنەوەی کۆمپیوتەریش دەتوانێت شتە ڕەشکراوەکان بگەڕێنێتەوە کارکردن لەسەر ئەو بەرنامەیە ئاسانە سەرەتا دێین بەرنامەکە دادەبەزێنین بۆسەر کۆمپیوتەرەکانمان پاشان دێین بەرنامەکە دەکەینەوە بەم شێوەیە وێنە ١

وێنە (١)

چوار لیست نوسراوە بەسەریەك لیستی یەکەم کە computer searchە ئەوەیان ئەگەر هاتو شتێکت لەپارچە هاردێکی کۆمپیوتەرەکەت رەشکردەوە پاشان ویستت بیگەڕێنیتەوە هەروەها هی دوەمیان بریتیە لە complete searchئەگەر شتێکت لەهەموو هاردەکانی ناوکۆمپیوتەر ڕەش کردەوە بەمەیان لەدوای دەگەڕێیت و دەیگەڕێنیتەوە هەروەها هی سێیەمیان کە format search ە ئەوەیان روون و ئاشکرایە کە پاش فۆرمات کردنی کۆمپیوتەر شتت بۆدەگەڕێنیتەوە وێنە ١

ئێستا ئەگەر بێت و هەرکامیان هەڵبژێرین پاشان next لێدەدەیت ئینجا لیستێك دێت کە هەمووهاردەکانی بۆت دیاری کردوە تۆتەنها ئەوهاردە هەڵدەبژێریت کە شتت لێی ڕەشکردۆتەوە بەدانانی هێمای ڕاستی وێنەی٢



وێنە (٢)

ئینجا دووبارە next لێدەدەین پاشان لیستێك دێت کەپێت دەڵێت چ جۆرە فایلێکت لێرەش بۆتەوە تۆش بەدانانی هێمای ڕاستی بەردەوام دەبی وێنەی ٣



وێنە (٣)

ئینجا START لێدەدەیت چاوەروان دەبیت تاوەکو بۆشایی بەرنامەکە پر دەبێت لەوشتانەی ڕەش بۆتەوە پاشان لەڕێگای SAVE ASەوە شتەکان کۆپی دەکەیتەوە ناو کۆمپیوتەرەکەت وێنە ٤



وێنە ( ٤ )

**تێبینی : هەر بابەتێك بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .**

- هەر بابەتێك لە شوێنێك یان لە گۆڤارێکی تری کوردی بڵاو کرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە .
- ئەگەر بابەتەکان ئەشیا بۆ بڵاو کردنەوە ئەوا بابەتەکە ناگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەنەکەی .
- هەر کەسێك بابەت ئەنێری بۆ بڵاو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بە تەواوی باسی بابەتەکە ڕوون بکاتەوە وبە بەرنامەی Microsoft Wordبابەتەکە بنووسرێت و وێنەکانی ڕوونکەرەوە لەگەڵ هەمان بابەت بنێرێت بۆمان بەڵام با وێنەکان لە نێو فۆڵدەرێکی جیاواز بێت و لەسەر سیدی یان لەسەر فلاش میمۆری بۆمان بنێرێت.

# بەرنـــــــــامەی تایبەت بە مۆبایل
# Sony Ericsson Themes Greator

ئا : محمد ضیاءالدین

بەرێزان وەك ئاگاداران دنیای مۆبایل هەرلەپێشكەوتنە و رۆژ بەدوای رۆژیش شتی پێشكەوتوتر دەردەچێت لەم بوارە كەچەندەهاجۆری پێشكەوتو كەوتۆتەبەردەستان كەبەرنامەی وای تێدایە لەكاتی سەیركردنی بۆلای خۆی ڕات دەكێشێت وەك جوانی باكراوند و جوانی گۆرانی بۆبەشەكانی تر ئێمەش زۆرجار حەزدەكەین مۆبایلەكانمان وێنەی خۆمانی تێدابێت یاخود ویچنەیەك كەبەئارەزوی خۆمان بۆی دابنێین بەلام ئەگەر بێت و بەرنامەیەك هەبێت كە تێكرای بەرنامەكانی ناو مۆبایلمان بۆبگۆرێت لەسەرداواكاری خۆمان ئەوكاتە زیاتر خولیای مۆبایلەكانمان دەبین لەبەرئەوەی ئێستا هەمووكەسێك بیەوێت دەبێتەخاوەن كۆمپیوتەری خۆی ئەوكاتە تەنها پێویستیت بەبەرنامەكە دەبێت بۆكاركردن بەویستی خۆت لەبەرئەوەی كەس وەك خۆت كارت بۆناكات بەرێزان كاركردن لەسەر ئەو بەرنامەیە زۆر گران نیە تەنها لە گەل`م بن بەوردی هەموكارەكان شیدەكەمەوە لەبەرئەوەی هەمو هەنگاوەكان تەنها داوای وێنەیەكت لێدەكات تۆش وێنەكەی دەدەیتێنەویش بۆت ڕێك دەخات تەنها هەنگاوی پێش كۆتایی نەبێت كە داوای دەنگێكت لێ دەكات و تۆش دەیدەیتێ بەرێزان ئەوبەرنامەیە تەنها بۆ مۆبایلی جۆری Sony Ericsson ە سەرەتا دێیت بەرنامەكە دەكەیتەوە وێنە ١




وێنە ( ١ )

پاشان کلیکێك لەسەر فایل دەکەیت و یەکەم نوسین هەڵدە بژێریت کە Change Phone لێدەدەی ئەم لیستە دێتە بەرچاو وێنە ١ کە لیستی مۆبایلەکانە بەگشتی ئینجا تۆ کام مۆدێلت هەیە هەر ئەوجۆرە هەڵدەبژێریت پاشان وێنەی ئەومۆبایلەی هەڵت بژاردوە دێتە روی بەرنامەکە لەلای سەرەوە یەکەم نوسین standbay یە هەروەهالەناوڕاست imoprt all & import هەیە تۆ ئەگەر بتەوێ وێنەیەك بۆ ڕوی یەکەمی مۆبایلەکە دیاری بکەیت لەرێگای import تەوە دێنیتە ناوبەرنامەکە یەکجار کلیك لەسەر import دەکەیت لیستی هاردەکان دەبێتەوە ئینجا تۆ وێنەکەت لەکام هار داناوە دێتە سەر وێنەکە دووجار کلیکی لەسەردەکەیت راستەو خۆ دێتە ناو بەرنامەکە بەلام لەگەڵ هاتنی وێنەکە لیستێکت پێنیشان دەدات کەپێت دەڵێ ئەووێنەیە گەورەیە یاخود بچوکە دەبێت قەبارەی پڕ بە مۆبایلەکە بێت تۆ ئەو کاتە بە ئارەزوی خۆت دەتوانی وێنەکە بچوك بکەیتەوە تا ئەو کاتەی کە پڕ بەشاشەی مۆبایلەکەت دەبێت وە لە هەمان کاتیشدا دەتوانی بچوکی نەکەیتەوە یەکسەر دابنێیت وێنە ٢



وێنە ( ٢ )

پاشان دێنە سەرلیستی دووەم کە ئەویش بریتیە لە Desktop واتا روبەری مۆبایلەکەت لەوێوەش هەمان کردار دوبارە دەکەینەوە پاشان دێت یەکە بەیەکە ئەمکارە دەکەیت پاشان دێتە سەر فایل لەوێوەش save as کارەکەت تەواو دەبێت ئینجا لەرێگای افرارێت یاخود بلوتوس دەینێریت بۆسەر مۆبایلەکەی خۆت